پووختەی

# كِتَابُ السُّنَّة

تأليفُ

الإمامِ أبي عبدِ الرَّحمن

عبدِ اللهِ ابنِ الإمامِ أحمدَ بنِ حنبلٍ الشَّيبانيِّ

٢١٣ - ٢٩٠ رحمهما الله تعالى


زَكَرِيّا الأَثَرِي

پووختەی

# كِتَابُ السُّنَّةِ

تأليفُ

الإمامِ أبي عبدِ الرَّحمن

عبدِ اللهِ ابنِ الإمامِ أحمدَ بنِ حنبلٍ الشَّيبانيّ

٢١٣ - ٢٩٠ رحمهما الله تعالى

• زكريا الأثري •

قالَ البُخاريُ رَحِمَهُ الله : حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الزُّبَيْرِ قَالَ : حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ : حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيُّ قَالَ : أَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيُّ أَنَّهُ سَمِعَ عَلْقَمَةَ بْنَ وَقَّاصٍ اللَّيْثِيَّ يَقُولُ : سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَلَى الْمِنْبَرِ قَالَ : سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ :

(إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا أَوْ إِلَى امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ) .

قال الإمام عبدالرحمن بن مهدي (**١٩٨** هـ) رحمه الله تعالى :

(لو صنفتُ كتابا في الأبواب لجعلت حديث عمر بن الخطاب في الأعمال بالنيات في كل باب) .

- البويطي ئەڵێت : بە الشافعی م وت : زۆر خۆت ماندوو ئەکەیت بە نووسینەوەی کتێب، وە خەڵک سەیری کتێبەکانت و نووسینەکانت ناکەن !

وتی : (ڕۆڵەکەم، ئەمە حەقە، وە حەقیش نافەوتێت).

- کاتێک ئیمام مالک کتێبی (المُوَطّأ) ی نووسی پێی وترا : (بۆچی ئەنووسیت لەکاتێکدا زانایانی تریش ئەنووسن ؟).

وتی : (ئەوەی بۆ الله بێت ئەمێنێتەوە).

- محمد بن عوف بن سفیان الطائي وتی : منداڵ بووم یاریم ئەکرد بە تۆپ، تۆپەکەم کەوتە مزگەوتەوە، وە کەوتە تەنیشت المعافي بن عمران .

چوومە ژوورەوە تۆپەکەم بهێنمەوە، المعافی پێمی وت : (کوڕەکە تۆ کوڕی کێیت ؟).

وتم : من کوڕی عوف م .

وتی : (عوف ی کوڕی سفیان ؟).

وتم : بەڵێ .

وتی : (باوکت لە براکانمان بوو کە خەریکی نووسینەوەی فەرموودە و زانست بوو، زۆر لە شێوە لە باوکت ئەچیت، بۆچی نایەیت تۆش بخوێنیت لامان ؟).

گەڕامەوە بە دایکمم وت .

دایکم وتی : ڕاست ئەکات ئەو هاوڕێی باوکت بوو .

پێڵاو و جلێکی جوانی لەبەرم کرد و ئینجا ڕۆشتم بۆ لای المعافي بن عمران، وە مرەکەب و وەرەقەشم پێ بوو .

پێمی وت : (بنووسە إسماعیل بن عیاش بۆمانی گێڕایەوە لە عبد ربە بن سلیمان وتی : أم الدرداء لەو دەفتەرەی کە تێیدا منی فێر ئەکرد نووسی : (زانست فێر بن لە منداڵیدا، وە لە گەورەیدا بە خەڵکی بڵێنەوە، وە هەموو کەسێک ئەو بەرهەمە ئەدوورێتەوە کە چاندوویەتی، جا ئیتر چاکە بێت یان خراپە) .

ئەوە یەکەم فەرموودە بوو فێری بووم .

# بسم الله الرحمن الرحيم

لەوکاتەوەی گروپە لادەرەکان لە بیروباوەڕی حەق سەریان هەڵدا سەلەف رحمهم الله تعالى دەستیان کرد بە ڕوونکردنەوەی عەقیدەی ڕاست و دەعوەکردن بۆی و ڕەددانەوەی گروپە گومڕاکان .

ئیمامەکانی سەلەف هەمیشە لە خەمی پاراستن و گەیاندنی دینی ئیسلام دا بوون، ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان داوە تا ئەو ئیسلامە بێخەوش و حەقە بگەیەنن کە سەلەفی پێش خۆیان لەسەری بووە، وە مەنهەجیان بریتی بووە لە قورئان و فەرمووده و ئاثاری ئەوانەی پێش خۆیان .

لەو کتێبانەی کە سەلەف رحمهم الله باسی هەموو یان بەشێکی زۆری عەقیدەی ئەهلی سوننەیان کردووە بریتین لە :

- الإستقامة في السنة لـإبن خشيش النسائي (**٢٥٣** هـ) .
- السنة لـحرب الكرماني (**٢٨٠** هـ) .
- السنة لـإبن أبي عاصم (**٢٨٧** هـ) .
- السنة لـعبدالله بن الإمام أحمد (**٢٩٠** هـ) .
- السنة لـالخلال (**٣١١** هـ) .
- شرح السنة لـالبربهاري (**٣٢٩** هـ) .
- الشريعة لـالآجري (**٣٦٠** هـ) .
- الإبانة الكبرى والصغرى لـإبن بطة (**٣٨٧** هـ) .

- شرح مذاهب أهل السنة لـ إبن شاهين (**٣٨٥** هـ) .
- أصول السنة لـ إبن أبي زمنين (**٣٩٩** هـ) .
- شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة لـ اللالكائي (**٤١٨** هـ) و زۆر كتێبی تر .

وه لەو كتێبانەی كە باسی بابەتێكی دیاریكراویان تێدا كردووه بریتین لە :
- القدر لـ إبن وهب (**١٩٧** هـ) .
- القدر لـ الفريابي (**٣٠١** هـ) .
- الإيمان لـ أبو عبيد القاسم بن سلام (**٢٢٤** هـ) .
- الإيمان لـ إبن أبي شيبة (**٢٣٥** هـ) .
- الإيمان لـ أحمد بن حنبل (**٢٤١** هـ) .
- الإيمان لـ محمد بن أسلم الطوسي (**٢٤١** هـ) .
- الإيمان لـ إبن منده (**٣٩٥** هـ)
- الرد علي الجهمية والزنادقة لـ أحمد بن حنبل (**٢٤١** هـ) .
- الرد علي الجهمية لـ الدارمي (**٢٨٠** هـ) .
- الرد علي الجهمية لـ إبن أبي حاتم (**٣٢٧** هـ) .
- الرد علي الجهمية لـ إبن منده (**٣٩٥** هـ) .
- الإختلاف في اللفظ والرد على الجهمية والمشبهة (**٢٧٦** هـ) .
- كتاب التوحيد لـ إبن خزيمة (**٣١١** هـ) .
- كتاب التوحيد لـ إبن منده (**٣٩٥** هـ) .
- خلق أفعال العباد لـ البخاري (**٢٥٦** هـ) .

- فضائل القرآن لـ أبو عبيد القاسم بن سلام (**٢٢٤** هـ).
- فضائل القرآن لـ إبن الضريس (**٢٩٤** هـ).
- فضائل القرآن لـ الفريابي (**٣٠١** هـ).
- فضائل القرآن لـ المستغفري (**٤٣٢** هـ).
- الأوائل لـ إبن أبي عاصم (**٢٨٧** هـ).
- الأوائل لـ الطبراني (**٣٦٠** هـ).
- الدعاء لـ المحاملي (**٣٣٠** هـ).
- الدعاء لـ الطبراني (**٣٦٠** هـ).
- دلائل النبوة لـ الفريابي (**٣٠١** هـ).
- دلائل النبوة لـ المستغفري (**٤٣٢** هـ).
- الزهد والرقاق لـ إبن المبارك (**١٨١** هـ).
- الزهد لـ وكيع بن الجراح (**١٩٨** هـ).
- الزهد لـ أسد السنة (**٢١٢** هـ).
- الزهد لـ أحمد بن حنبل (**٢٤١** هـ).
- الزهد لـ أبو داود السجستاني (**٢٧٥** هـ).
- التفسير لـ يحيى بن آدم (**٢٠٠** هـ).
- التفسير لـ عبدالرزاق (**٢١١** هـ).
- التفسير لـ أحمد بن حنبل (**٢٤١** هـ).
- التفسير لـ إبن وهب (**٣٠٦** هـ).

- التفسير لـ الطبري (٣١٠ هـ) .
- التفسير لـ إبن المنذر (٣١٨ هـ) .
- التفسير لـ إبن أبي حاتم (٣٢٧ هـ) .
- التفسير لـ إبن أبي زمنين (٣٩٩ هـ) .
- الأربعين لـ محمد بن أسلم الطوسي (٢٤٢ هـ) .
- الأربعين لـ النسوي (٣٠٣ هـ) .
- النقض على المريسي لـ الدارمي (٢٨٠ هـ) .
- العرش لـ محمد بن عثمان بن أبي شيبة (٢٩٧ هـ) .
- الرؤية لـ الدارقطني (٣٨٥ هـ) .
- الصفات لـ الدارقطني (٣٨٥ هـ) .
- النزول لـ الدارقطني (٣٨٥ هـ) .
- التنبيه والرد على أهل الأهواء والبدع (٣٧٧ هـ) .
- العظمة لـ أبي الشيخ (٣٦٩ هـ)
- شعار أصحاب الحديث لـ أبو أحمد الحاكم (٣٨٧ هـ) و زۆر كتێبی دیکە .

وە لەو کتێبە بچووکانەی بە گشتی یان لە بابەتێکی دیاریکراودا باسی عەقیدەی ئەهلی سوننەی تێدا کراوە بریتین لە :

- أصول السنة لـ الحميدي (٢١٩ هـ) .
- أصول السنة لـ أحمد بن حنبل (٢٤١ هـ) .
- صريح السنة لـ الطبري (٣١٠ هـ) .

- إعتقاد الأوزاعي (١٥٧ ھ).
- إعتقاد سفيان الثوري (١٦١ ھ).
- إعتقاد إبن الماجشون (١٦٤ ھ).
- إعتقاد الشافعي (٢٠٤ ھ).
- إعتقاد علي بن المديني (٢٣٤ ھ).
- إعتقاد قتيبة بن سعيد (٢٤٠ ھ).
- إعتقاد سحنون المالكي (٢٤٠ ھ).
- إعتقاد البخاري (٢٥٦ ھ).
- إعتقاد الذهلي (٢٥٨ ھ).
- إعتقاد المزني (٢٦٤ ھ).
- إعتقاد الرازيين.
- إعتقاد أحمد بن سريج الشافعي (٣٠٦ ھ).
- إعتقاد أبي عوانة الإسفراييني الشافعي (٣١٦ ھ).
- إعتقاد أبو عبدالله الزبيري (٣١٨ ھ).
- إعتقاد إبن شاهين (٣٨٥ ھ).
- إعتقاد إبن أبي زيد (٣٨٦ ھ) و زۆر کتێبی تر.

ناوی ئەم کتێبانەمان بۆ درێژکردنەوەی لاپەڕەی کتێبەکان نەهێناوە، بەڵکو بۆ ئەوەی ئەهلی سوننە تەماشا بکەن و تێبفکرن کە سەلەفیان رحمهم الله چەندە خەمخۆر و هەوڵدەربوون بۆ پاراستن و گەیاندنی عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە،

وە تێبکۆشێت و لە هەموو بوارەکانی ژیانیدا چاویان لێبکات و بیانکات بە سەرمەشق و پێشەوای خۆی، وە بۆ ئەوەی سوپاس و ستایشی الله عز وجل بکەن کە ئەم پیاوانەی موسەخەر کردووە بۆ پاراستن و گەیاندنی دینە حەقەکەی و ئاواتەخواز بێت ئەمیش ببێت بە یەکێک لەو کەسانەی کە الله عز وجل بەهۆیەوە دینەکەی ئەپارێزێت و ئەیگەیەنێت .

وە بۆ ئەوەی ئەهلی سوننە چاوی بگەشێتەوە بە زۆری کتێبەکانی سەلەف و دەست بکات بە خوێندنەوە و تێڕامان و کارپێکردن و گەیاندن یان، وە وەکو خوێنەرەکانی تر کتێبی بیدعەچی و گومڕا و بگرە کافرەکانیش نەخوێنێتەوە بە بیانوی ئەوەی خزمەتی دینیان کردووە !

ئەم کتێبەی بەردەستمان بریتیە لە (کتاب السنة لـ عبدالله بن الإمام أحمد بن حنبل - **٢٩٠** ھ) رحمه الله .

کورتترین وەسف بۆ ئەم کتێبە ناوازەیە بریتیە لە : (کتێبێک کە هیچ بیدعەچی و گومڕا و کافرێک نییە ئیللا ڕقی لێیەتی) .

یان (شاکاری ئەهلی سوننەیە) .

ئەم کتێبە گرنگی خۆی پەیدا کردووە بەهۆی پێگەی بەرز و پێشەوایەتی نووسەر و باوکی لەناو سەلەف و ئەهلی سوننە بە گشتی بەهۆی ئەو مەنهەج و ڕێبازە حەقەی گرتوویانەتە بەر .

وە بەهۆی ئەو شێخ و ئیمامانەی ڕیوایەتیان لێوە ئەکات .

وە هەروەها بەهۆی ئەو بابەتە عەقیدەییە گرنگانەی باسی ئەکات .

لەم کتێبەدا ئیمامی بە چڕی باسی جەهمیەکان و مورجیئەکان و ئەبو حەنیفەی ئیمامی ئەهلی ڕەئی و قەدەریەکان و ڕافیزە و خەواریجەکان ئەکات ،

هەربۆیە ئەبینیت هەموو بیدعەچیەک یان کافرێک لەبەر بابەتێک ئەو بابەتانەی ئیمام باسی کردووە ڕقی لە کتێبەیە و چاویی پێی هەڵنایەت .

ئیشی ئێمە لەم کتێبەدا بریتیە لە پوخت کردنەوە و لێدوان لەسەر هەر بابەتێک کە پێویستی بە ڕوونکردنەوە کردووە .

بۆ هەر سەرە بابەتێک ڕوونکردنەوەیەکمان داوە هەتا خوێنەر بزانێت ئیمام رحمه الله قورئان و فەرموودە و ئاثارەکانی ئەو باب ـەی بە چ مەبەستێک هێناوە و زیاتر لێیان تێبگات .

لەگەڵ ئەوەشدا پێش چوونەسەر بابەتی کتێبەکە بە کورتی باسی ژیاننامە و پێگەی نووسەرمان کردووە رحمه الله .

داواکارین لە الله تعالی ئەم کارەمان تەنها لە پێناو خۆی و لەسەر سوننەتی پێغەمبەرەکەی بووبێت ﷺ، وە بیکات بە مایەی چاوگەشی بۆ نووسەر و ئامادەکار و خوێنەر، وە لە ڕیزی ئەهلی حەدیث لە دنیا و قیامەتدا هەژمارمان بکات و بمانکاتە بەهەشتەیەکەوە، آمین .

# أبو عبدالرحمن عبدالله بن أحمد بن حنبل

## (٢١٣ - ٢٩٠ هـ)



- ڕیوایەتی کردووە لە باوکی و، عبدالأعلى بن حَمَّاد و، يحيى بن مَعين و، أبو بكر بن أبي شَيبة و، عثمان بن أبي شَيبة و، عباس بن الوليد النَّرسي و، أبو خَيثَمَة زُهَير بن حَرب، سُوَيد بن سعيد و، أبي الرَّبيع الزَّهراني و، سُفيان بن وَكيع بن الجَرَّاح و، سَلَمَة بن شَبيب و زۆر زانای تری سەلەف رحمهم الله تعالى.

- أبو القاسم البَغَوي و، المَحامِلي و، أبو بكر النَّجّاد و، الطَبَراني و، أبو بكر الخَلّال و أبو الحسين بن المُنادي زۆر زانای دیکەی سەلەف رحمهم الله ڕیوایەتیان لێوە کردووە .

- ثِقَة و ثَبت و ئیمام بووە .

- بدر بن أبي بدر البغدادي دەربارەی ئەڵێت : (عبدالله بن أحمد لێهاتووی کوڕی لێهاتووە) .

- عباس الدوري ئەڵێت : ڕۆژێکیان لەلای أحمد بن حنبل بووم، عبدالله ی کوڕی هات بۆ لامان، أحمد پێی وتم : (ئەی عباس، أبو عبدالرحمن فێری زانستێکی زۆر بووە) .

- أبو زرعة ئەڵێت : أحمد بن حنبل پێی وتم : (عبدالله ی كوڕم خاوەنی بەشێكی باشە لە زانستی فەرموودەدا - یان لە لەبەركردنی فەرموودەدا -، خەریكە وای لێ دێت تەنها ئەو فەرموودەیانەم پێ ئەڵێت كە من لەبەرم نییە).

- إبن عدي دەربارەی ئەڵێت : (گەورە و بەڕێز بوو بەهۆی باوكیەوە، وە خودی خۆی پێگەی هەیە لە زانستدا، زانستی باوكی ژیاندەوە لە (المسند) ەكەی، ئەوەی كە باوكی بە تایبەتی بەسەریدا خوێندەوە پێش ئەوەی بەسەر كەسی تردا بیخوێنێتەوە، وە پرسیاری لە باوكی كردووە دەربارەی ڕاویەكانی فەرموودە و پێی وتووە كە كەسانی تر پرسیاریان لێنەكردووە دەربارەی، وە لە هیچ كەسێكەوە نەینوسیەوە ئیللا ئەو كەسانە نەبێت كە باوكی فەرمانی پێ كرد لێیانەوە بنووسێتەوە).

- أبو جعفر العقيلي ئەڵێت : پرسیارم كرد لە عبدالله بن أحمد بن حنبل : بۆچی نەتنوسیەوە لە علي بن الجعد؟

وتی : (باوكم ڕێگری لێكردم بچم بۆ لای، پێی گەیشتبویەوە كە قسەی بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وتووە).

- الخلال وتی : كاتێک گەڕامەوە لە كرمان عبدالله پرسیاری لێكردم دەربارەی حَرب، وە دەربارەی ئەوەی لەلای بووە لە پرسیار و وەڵام و الأحكام و العلل، وە داوای ئەوەی لێكردم كە كۆم كردووەتەوە لە پرسیار و وەڵامی أبو عبدالله.

- الخلال وتی : (عبدالله لە باوكیەوە مَسَائِل ێكی زۆر باشی گێڕاوەتەوە، وە دەربارەی الأحكام شتانێكی زۆری لەلایە كە لەلای كەسانی تر نییە، وە هەرچی

دەربارەی العلل ـه، زۆر شتی باشی گێڕاوەتەوە لێی، وە شتانێکی زۆری لەلایە کە لەلای کەسانی تر نییە).

- **الخلال** وتی : خوێندمەوە لە نامەی أبي الحسين المُنادي دا، وە باسی عبدالله و صالح ی کرد و وتی : (صالح کەمی لە باوکیەوە ئەنووسیەوە - **بەهۆی زۆری ئیش و ماڵ و منداڵ** -.

بەڵام عبدالله هیچ کەسێک نەبووە زیاتر لە ئەو لە باوکیەوە رحمه الله بگێڕێتەوە، چونکە لێیەوە گوێبیستی (المُسنَد) بوو کە سی هەزار فەرموودەیە، وە (التَّفسير) کە سەد و بیست هەزارە، نەوەد هەزاری لەخۆیەوە گوێلێبوو، ئەوەی تری الوجادة یە .

وە لێیەوە گوێبیستی (النَّاسِخ والمَنسوخ) و (التّاريخ) و (حَديث شُعبة) و (المقدَّم والمؤخَّر في كِتابِ الله) و (جَوابات القُرآن) و (المَنَاسک) ی گەورە و بچووک، وە بێجگە لەوانە لە کتێب و فەرموودەی شێخەکان .

وە هەتا ئێستاش ئەبینین کە شێخەکانمان شایەتی بۆ ئەدەن بە ناسینی پیاوەکان - **واتە هی سەنەد** -، وە عیلەلی فەرموودەکان، وە ناو و نازناوەکان، وە بەردەوام بوون لەسەر طەلەبی فەرموودە، وە لە پێشینەکانیانەوە ئەو دانپێدانانانە باس ئەکەن دەربارەی .

بگرە هەندێک کەس زیادیان وت لە مەدحکردنیدا و وتیان لە باوکی زاناترە و زیاتر گوێبیستی فەرموودە بووە، وە پێم گەیشتووەتەوە کە ئەو قسەیەی پێ ناخۆش بووە و وتوویەتی : (باوکم رحمه الله هەزار هەزار فەرموودەی ئەزانی) .

وە وتی : (هەموو ئەو شتانەی کە تیایاندا ئەڵێم (باوکم وتی) ئەوە دوو سێ جار گوێبیستی بووم، کەمترینیان یەک جارە) .

- الخلال وتی : حرب الكرماني وتی : أبو عبدالله لەماڵ دەرچوو تا کتێبی (الأشربة) م بەسەردا بخوێنێتەوە، جا عبدالله ی کوڕی هات، ئەوکاتە منداڵ بوو، وتی : ئەی تۆ پەیمانت پێم نەدا بەسەر مندا بیخوێنیتەوە ؟

جا أبو عبدالله ئەیویست دڵی ڕازی بکات و ئارامی بکاتەوە، ئیتر عبدالله دەستی کرد بە گریان .

أبو عبدالله پێی وتم : لەسەرم بووەستە هەتا ئەڕۆمە ماڵەوە و ئەیخوێنمەوە بەسەریدا .

ئیتر أبو عبدالله چوویە ژوورەوە و خوێندیەوە بەسەریدا و هاتە دەرەوە .

- الخلال وتی : أبو بكر المروذي وتی : کاتێک أبو عبدالله سوێندی خوارد کە فەرموودە نەگێڕێتەوە، لای کردەوە بەلای عبدالله ی کوڕیدا و وتی : (ئەگەرچی ئەمەش زۆری حەز لە فەرموودە بێت) .

واتە عبدالله کەسێکی زۆر طالب علم بووە .

- عبدالله ئەڵێت : (گوێبیستی باوکم بووم وتی : کاتێک من و يحيى بن معين گەیشتین بە صَنعاء لە یەمەن لە کاتی نوێژی عەسردا، پرسیارمان دەربارەی ماڵی عبدالرزاق کرد .

وتیان : لە گوندێکە پێی ئەوترێت الرَّمادة، منیش بەرەو ئەوێ بەڕێکەوتم پەرۆشبووم بۆ بینینی، وە یحیى بن معین بەجێما، گوندەکە لە صَنعاء ـەوە نزیک بوو، پرسیارم کرد دەربارەی ماڵەکەی .

وتیان : ئەوە ماڵەکەیەتی .

کاتێک ڕۆیشتم تەقە بدەم لە دەرگاکەی بەقاڵێک کە بەرامبەر ماڵەکەی وەستابوو وتی : نەکەی، تەقەی لێ نەدەیت، شێخ کەسێکی بەسام و هەیبەتە - **واتە بووەستە تا خۆی دێتە دەرەوە -** .

منیش دانیشتم هەتا نزیکی کاتی نوێژی مەغریب، پێش نوێژی مەغریب هاتە دەرەوە لە ماڵ، منیش بەرەو ڕووی ڕۆیشتم و چەند فەرموودەیەکم نووسیبوو کە خۆم هەڵبژرادبوو، پێم وت : سلام علیکم، ڕەحمەتی الله ـت لێبێت ئەتوانیت ئەم فەرموودەیانەم بۆ بگێڕیتەوە ؟ من کەسێکی ڕێبوار و نامۆم .

وتی : تۆ کێیت ؟

وتم : أحمد بن حنبل ـم .

جا هاتە دواوە و باوەشی پێداکردم وتی : تو الله تۆ أبو عبدالله ـیت ؟

دواتر فەرموودەکانی وەرگرت، بەردەوام بوو لە خوێندنەوەی هەتا لەبەر تاریکی نەیتوانی بیخوێنێتەوە، بە بەقاڵەکەی وت : ئەو چرایە بهێنە .

عبدالله وتی : جا کاتێک باوکم بیری ئەکەوتەوە کە لەلای عبدالرزاق ناویان هێناوە دەستی ئەکرد بە گریان ) .

- عبدالله ئەڵێت : (أبو عبدالله - واته باوكی - كەسێكی ڕاستگۆ و بە شەرم و حەیا بوو) .

- الطبراني وتی : عبدالله بن أحمد بن حنبل بۆی گێڕاینەوە وتی : باوكم بۆی گێڕاینەوە وتی : (گۆڕەكانی ئەهلی سوننە لە ئەهلی تاوانە گەورەكان باخ ـن، وە گۆڕەكانی بیدعەچییەكان لە دنیانەویستەكان چاڵێكە - واتە لە ئاگر -، تاوانبارەكانی ئەهلی سوننە خۆشەویستی الله ـن، وە بیدعەچیە دنیانەویستەكانیش دوژمنی الله ـن) .

- عبدالله وتی : باوكم وتی : (ئەم كتێبەم - واتە المُسنَد - كردووە بە پێشەوایەک، تا كاتێل خەڵكی لە سوننەتی رسول الله دا ڕاجیاوازیان تێكەوت بگەڕێنەوە بۆی) .

- عبدالله وتی : (باوكم (المُسنَد) ی لە حەوسەد هەزار فەرموودە دەرهێنا).

- عبدالله وتی : پرسیار لە باوكم كرا : بۆچی هاوڕێیەتی خەڵكی ناكەیت ؟

وتی : (لەبەر ناخۆشیی جیابوونەوە) .

- عبدالله وتی : گوێم لێبوو باوكم بە یحیی بن معین ی وتی : (أبا زكریا پێم گەیشتووە ئەڵێیت : إسماعیل بن علیة بۆی گێڕاینەوە ؟) .

وتی : بەڵێ، وا ئەڵێم .

باوكم وتی : (وا مەڵێ، بەڵكو بڵێ إسماعیل بن إبراهیم، چونكە پێم گەیشتووەتەوە كە پێی ناخۆش بووە بدرێتە پاڵ دایكی) .

يحيى بە باوكمی وت : (لێمان وەرگرتيت ئەی مامۆستای خێر و چاكە) .

- عبدالله ئەڵێت : الحسن بن محمد الزعفراني وتی : (كاتێک كتێبەكانم ئەخوێندەوە بەسەر الشافعي دا أبو عبدالله أحمد بن حنبل ئامادەبوو، كاتێک الشافعي بڵێت : (ثِقَة يەک بۆی گێڕامەوە) ئەوە مەبەستی أحمد بن حنبل ی باوكتە) .

بسم الله الرحمن الرحيم

اللهم صلى على محمد نبي الرحمة، وآله وصحبه وسلم

## باب : (١)

## پرسیاری لێكرا دەربارەی ئەوەی زانایان وتوویانە دەربارەی جەهمیە گومڕاكان، وە تەكفیر كردنیان و نوێژكردن لە پشتیان



(وتەی : (پرسیاری لێكرا) واتە پرسیار لە عبداللە ی كوڕی ئیمام أحمد كرا .

ئیمام رحمە اللە تعالى لەم باب ـەدا چەند وتەیەک ئەهێنێت دەربارەی تەكفیركردنی ئەو جەهمیانەی ئەڵێن قورئان مخلوق ـە،وە چەند ئەثەرێک ئەهێنێتەوە كە تیایاندا زانایانی سەلەف رحمهم اللە تەكفیری معین ی ئەو كەسەیان كردووە كە وتوویەتی قورئان مخلوق ـە بەبێ عوزر بۆ هێنانەوە و ئیقامە حوججەكردن .

وە چەند ئەثەرێكی تر ئەهێنێت ئەوە ئەخاتەڕوو جەهمیەكانی سەرەتا لە قسەكانیان ئەوە خوێندراوەتەوە كە بڵێن اللە عز وجل لەسەر عەرش نییە ، بەڵام

بەهۆی توندی زانایانی سەلەف رحمهم الله لەسەریان نەیانتوانیوە بە ڕاشکاوی دەری ببڕن، وە ئێمەش ڕوونمان کردووەتەوە ئەوەی کە جەهمیە کۆنەکان نەیانئەتوانی دەریببڕن ئەشعەریە جەهمیەکان بە ئاشکرا وتیان و شوێنکەوتەکانی قورئان و سوننەت و ئاثارەکانی سەلەفیان لەسەر تەکفیر کرد).



١ - **أحمد بن حنبل** وتی : (ئەوەی بڵێت قورئان مخلوق ـە، ئەو کەسە لەلامان کافرە، لەبەر ئەوەی قورئان لە عیلم ی الله عز وجل ـە، وە ناوەکانی الله ی عز وجل تێدایە).

**سوودێک : کاتێک کەسێک ئەڵێت قورئان مخلوقە ئەوە کافرە.**

**- یەکەم لەبەر ئەوەی کەلامی الله ی بە مخلوق زانیوە.**

**- دووەم لەبەر ئەوەی زانستی الله ی بە مخلوق زانیوە چونکە کەلامی الله لە زانستی الله تعالی ـەوەیە.**

**- سێیەم لەبەر ئەوەی کە ناوەکانی الله بە مخلوق ئەزانێت، بۆ نمونە ناوەکانی الرحمن و الرحیم.**

**بە قسەی ئەم جەهمیانە بێت الله تعالی نە کەلام و نە ناو و نە سیفات و نە عیلمی هەبووە، پاشان ئەمانەی هەمووی دروست کردووە! لەم کوفرە ڕوونتر چییە ؟**

واتە ئەوەی بڵێت قورئان مخلوق ـە نەفی کەلام و عیلم و ناو و سیفاتەکانی الله ی کردووە، هەر بۆیە لەلای ئەوان الله تعالی هەموو شتەکانی دروستکراوە، وجوودێکی حەقیقی نییە، تەنها بوونێکی خەیاڵی هەیە .

٢ - أحمد بن حنبل وتی : (ئەوەی بڵێت قورئان مخلوق ـە، ئەوە لەلامان کافرە، چونکە کەلامی الله لە زانستی الله عز وجل ـەوەیە، الله ئەفەرمووێت : ﴿ فَمَنْ حَاجَّكَ فِيهِ مِن بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ ﴾ (آل عمران : ٦١) . . . . ) .

٣ - سلام بن أبي مطيع وتی : (جەهمیەکان کافرن، نوێژیان لە پشتەوە ناکرێت ) .

---

: لەوانەیە کەسێک بڵێت : نوێژ لەدوای بیدعەچیەکی بانگەوازکاریشەوە بۆ بیدعەکەی ناکرێت، لەوانەیە مەبەستی ئەوە بێت.

منیش ئەڵێم : جوان بیخوێنەرەوە کە ئەڵێت (نوێژیان لە پشتەوە ناکرێت)، ئەی باشە هۆکاری نوێژ نەکردن لە پشتیەوە چییە ؟!

لەبەر ئەوەی (جەهمیەکان کافرن) ،ئەئەرەکە لەوپەڕی ڕوونێتیدایە.

٤ - خارجة وتی : (جەهمیەکان کافرن، هەواڵ بدەن بە ژنەکانیان کە تەڵاقیان کەوتووە، وە حەڵاڵ نین بۆ مێردەکانیان . . . . ) .

: لەبەر ئەوەی كە كافر بوون ژنەكانیشیان لێیان حەرام بوون.

٥ - سفيان الثوري وتی : (هەر كەسێک بڵێت كە كەلامی الله عز وجل : | يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ | (النَّمْلِ : ٩) مخلوق ـە، ئەوە كافرە، زەندیقە، خوێنی حەڵاڵە) .

: دوای ئەوەی كە وتی كافرە خوێنیشی حەڵاڵ كرد، ئەگەر كافر و مورتەد نەبووبێتەوە خوێنی حەڵاڵ ناكات.

٦ - سفيان الثوري وتی : (هەر كەسێک بڵێت : | قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ (١) ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ | مخلوق ـە ئەوە كافرە) .

: ئەگەر كەسێک بڵێت | قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ (١) ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ | مخلوق ـە لەبەر چەند هۆكارێک كافرە.

- وتوویەتی كەلامی الله مخلوق ـە.

- وتوویەتی ناوی | ٱلصَّمَدُ | ی الله مخلوق ـە.

- وتوویەتی فەرمانی الله | قُلْ | مخلوق ـە.

بە کورتیەکەی هەر کەسێک بڵێت قورئان مخلوق ە تەواوی کەلام و ئەو ناو و سیفاتانەی لە قورئاندا هاتووە بە مخلوق ی ئەزانێت .

٧ - النضر بن محمد وتی : (هەر کەسێک بڵێت : | إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي | (طه : ١٤) مخلوق ە ئەوە کافرە . . . . ) .

---

: ئەگەر کەسێک بڵێت ئەو ئایەتەی سەرەوە مخلوق ە ئەوە کافرە لەبەر ئەوەی وتوویەتی کەلامی الله مخلوق ە.

وە کە ئەڵێت ئەو ئایەتە مخلوق ە ئەوە پێی وایە کە الله تعالی فەرمانی کردووە لە قورئانەکەیدا ئێمە شتێکی مخلوق بپەرستین، هەربۆیە دووجار کافرە.

٨ - إبن المبارک وتی : (هەر کەسێک بڵێت قورئان مخلوق ە ئەوە زەندیقە ) .

٩ - سفيان بن عيينة وتی : (قورئان کەلامی الله عز وجل ە، هەر کەسێک بڵێت مخلوق ە ئەوە کافرە، وە هەر کەسێک شکی لە کوفرەکەی هەبێت - کوفری یەکەم کەس کە ئەڵێت قورئان مخلوق ە - ئەوە کافرە ) .

---

: کافربوونی کەسی یەکەم براوەتەوە باسی کافربوونی کەسی دووەم ئەکات .

١٠ - وكيع بن الجراح وتی : (من تۆبە ئەكەم بە جەهمی ، ئەگەر تۆبەی كرد باشە ، ئەگەر نەیكرد ئەیكوژم) .

١١ - إسحاق بن أبي عمر پێی وتی : بە وكیع وترا : چی ئەڵێیت دەربارەی سەربڕاوی جەهمیەكان ؟

وتی : (ناخورێت ، ئەوانە مورتەدن) .

١٢ - حماد بن زيد باسی جەهمیەكانی كرد و وتی : (ئەوان هەوڵی ئەوە ئەدەن بڵێن : هیچ لە ئاسمان نییە - واتە الله تعالى لەسەر عەرش نییە - ) .

١٣ - فطر بن حماد بن أبي عمر الصفار وتی : پرسیارم لە معتمر بن سليمان كرد : ئەی باوكی محمد ئیمامی كۆمەڵێك لە خەڵكی ئەڵێت قورئان مخلوق ـە ، نوێژی لە پشتەوە بكەم ؟

وتی : (ئەوە ئەبێت لە ملی بدرێت) .

فطر وتی : وە پرسیارم لە حماد بن زيد كرد وتم : ئەی باوكی ئیسماعیل ئیمامێكمان هەیە ئەڵێت قورئان مخلوق ـە ، ئایا نوێژی لە پشتەوە بكەم ؟

وتی : پێم خۆشە لە پشتی موسوڵمانێكەوە نوێژ بكەیت . . . .) .

---

: دیقەت بدە پرسیارکەرەکە ئەڵێت : (ئیمامێکمان هەیە ئەڵێت قورئان مخلوق ـە)، وشەی (ئیمامێک) دیار نییە کە خودی کەسەکە کێیە، بەڵام معمتر بن سليمان ئەڵێت

**ئەبێت لە ملی بدرێت بەبێ ئەوەی بزانێت خودی کەسەکە کێیە، وە تەنها بە تەکفیر ی معین نەوەستا، بەڵکو حوکمی کوشتنیشی دا بە سەریدا.**

**وە حماد بن زید نازانێت (ئیمامێک) کێیە، باسی ئەوە ناکات ئیقامە حوججە کراوە یان نا، بەڵکو ئەڵێت پێم خۆشە لە پشتی موسوڵمانێکەوە نوێژ بکەیت، واتە لە پشتی ئیمامەکەی خۆتان نوێژ مەکە چونکە کافرە .**

١٤ - **عبدالرحمن بن مهدي** وتی : (ئەگەر دەسەڵاتم هەبوایە ئەوە ئەچوومە سەر پردەکە - **دیارە پردێکی ناسراوە لە سەردەمی ئەودا هەبووە** -، ئەم ئەهێڵا هیچ کەسێکی جەهمی لەوێوە بڕوات ئیللا پرسیارم لێ ئەکرد دەربارەی قورئان، ئەگەر بیوتایە مخلوق ە ئەوە لە ملیم ئەدا و ئەمخستە ناو ئاوەکەوە) .

١٥ - إبن أبي الأسود وتی : (گوێم لە **عبدالرحمن بن مهدي** بوو لەڕاسەری یحیی بن سعید ەوە ڕاوەستا بوو و پێی وت : ئەی باوکی سعید، ئەگەر کەسێکی جەهمی بمرێت و من میراتگری بم، ئەوە حەڵاڵ نییە بۆم میراتی لێ بگرم) .

---

**: لەبەر فەرموودەی رسول الله ﷺ : (موسوڵمان میرات لە کافر ناگرێت) .**

١٦ - **عبدالرحمن بن مهدي** وتی : (جەهمیەکان تۆبەیان پێ ئەکرێت، ئەگەر تۆبەیان نەکرد لە ملیان ئەدرێت) .

١٧ - شاذ بن يحيى وتی : **يزيد بن هارون** له ماڵەكەی خۆیدا سوێندی بۆ خواردم وتی : (والله الذي لا إله إلا هو، عالم الغيب والشهادة، الرحمن الرحيم، ئەوەی بڵێت قورئان مخلوق ـە ئەوە زەندیقە).

١٨ - شاذ بن يحيي وتی : گوێم لە **يزيد بن هارون** بوو پرسیاری لێ كرا جەهمیەكان كێن ؟

وتی : (ئەوەی وا گومان ببات | **الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ** | بە خیلافی ئەوەیە كە لە دڵی خەڵكی ئاساییدا جێگیر بووە ئەوە جەهمیە) .

---

**: هەموو كەسێک بە فیترەت ئەزانێت كە الله تعالى لە بەرزیە و لە سەروو خۆیەوەیەتی لە ئاسمان، وە كاتێک هەموو موسوڵمانێک بە زانا و عەوامیانەوە ئەو ئایەتەی سەرەوە ئەبیستن بەڕاستی ئەخەنەوە و تێئەگەن كە الله عز وجل لەسەرو عەرشەوەیە، ئەمە تێگەیشتنی كەسانی موسوڵمانە بۆ ئەو ئایەتە، وە بە هەمان شێوە تێگەیشتنی زانایانی سەلەفە رحمهم الله، بەپێچەوانەی تەواوی گروپە جەهمیەكان لە ئەشعەری و موعتەزیلی و ماتوریدیەكان كە ئەو ئایەتە زۆر لەسەریان قورسە و ئیمانیان پێ نییە و پێی كافرن، چونكە لەگەڵ عەقیدەی كەلامیەكەیاندا ناگونجێت، هەربۆیە تەحریفی ئەكەن بۆ مانایەک كە لەگەڵ عەقیدە كەلامیە كوفریە یۆنانیەكاندا بگونجێت .**

**لە تەحریفكردنی ئەم سیفەتەدا موخالەفەی دەقی ڕاشكاوی قورئان و فەرموودە و ئاثاری سەلەف و بگرە فیترەتی خۆشیان ئەكەن .**

**یەكێكی وەكو إبن حجر العسقلاني كە زیاتر لە ٢٠٠ شوێن كتێبی بەناو فتح الباري ـدا هەمان قسەی جەهمیەكانی سەرەتا و بگرە خراپتریش ئەكات كەچی سەرەڕای ئەو هەموو**

كوفرە كۆمەڵە گومڕا و جاهیل و كاڵفام و لادەر لە مەنهەجی پاكی سەلەف دێن بەرگری لێ ئەكەن و ئەڵێن ئەسڵەن هەر ئەشعەری نەبووە!

**١٩** - شاذ بن يحيى وتی : گوێم لە **يزيد بن هارون** بوو وتی : (هەر كەسێک بڵێت قورئان مخلوق ە، سوێند بەو الله یەی كە هیچ پەرستراوێک شایەنی پەرستن نییە بە حەق بێجگە لە ئەو، ئەوە زەندیقە) .

**٢٠** - **معاذ بن معاذ** وتی : (ئەوەی بڵێت قورئان مخلوق ە، ئەوە كافرە) .

**٢١** - **شبابة بن سوار** و **عبدالعزيز بن أبان القرشي** وتیان : (قورئان كەلامی الله یە، ئەوەی بڵێت ببات مخلوق ە كافرە) .

**٢٢** - **عمر بن ربيع بن طارق** وتی : (ئەوەی بڵێت قورئان مخلوق ە كافرە).

**٢٣** - **عباد بن عوام** وتی : (قسەم لەگەڵ بشر المريسي و هاوەڵانی كرد، تێگەیشتم كە كۆتایی قسەكانیان بۆ ئەوە ئەچوو بڵێن : لە ئاسمان هیچی لێ نییە - واتە الله تعالى لەسەر عەرش نییە - .

---

: لێرەدا قسە لەسەر ئەثەری ١٢ ش كراوە

: تەماشا بكە رحمك الله حماد بن زيد ساڵی ١٧٩ هـ وەفاتی كردووە، ئەڵێت جەهمیەكان هەوڵ ئەدەن بڵێن هیچ لە ئاسمان نییە، واتە ئەیانەوێت بڵێن الله تعالى لەسەر

**عەرش نییە، بەڵام ئەوکاتە لەبەر زانایانی ئەهلی سوننە نەیانئەتوانی ئەو کوفرە ئاشکرا و زەقە دەرببڕن، هەر بۆیە ئەوکات جەهمیەکان بە ڕاشکاوی نەیانئەوت کە الله لەسەر عەرش نییە.**

**بەڵام ئەشعەریەکی جەهمی وەکو إبن حجر العسقلاني لە شەرحە پڕ تەحریفەکەی بۆ سەحیحی بوخاری بەرگی ١ لاپەڕە ٥٠٨ لەبارەی فەرموودەیەکەوە بە ئاشکرا نەفی علو ئەکات و ئەڵێت : (ئەمە ڕەددی تێدایە بۆ ئەوانەی کە وا گومان ئەبەن الله بە ذاتی خۆی لەسەر عەرشە!) .**

**ئەوەی جەهمیەکان لە سەردەمی سەلەفدا نەیانئەوێرا بە ئاشکرا دەریببڕن ابن حجر العسقلاني بە ئاشکرا دەریئەبڕێت، بەڵکو لە شوێنێکی دیکەدا ئەڵێت خیلاف هەیە دەربارەی تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە ئەڵێت الله لەسەر عەرشە!**

**٢٤ - يحيى بن معين** وتی : (ئەوەی بڵێت قورئان مخلوق ە ئەوە کافرە) .

**٢٥ - أبو عبيد القاسم بن سلام** وتی : (هەر کەسێک بڵێت قورئان مخلوق ە ئەوە درۆی بۆ الله عز وجل هەڵبەستووە، وە شتێکی وتووە دەربارەی کە تەنانەت یەهودی و نەسرانیەکانیش نەیانوتووە) .

**٢٦ -** إسحاق بن بهلول وتی : بە **أنس بن عياض أبي ضمرة** م وت : ئایا نوێژ لە پشت جەهمیەوە بکەم ؟

وتی : نەخێر، ﴿**وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَـٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ**﴾ (آلِ عِمْرَانَ : ٨٥)

٢٧ - أحمد بن إبراهيم وتی : (يحيى بن معين پێی وتم كە نوێژی جومعە ئەگێڕیتەوە لەو كاتەوەی عبدالله بن هارون المأمون ئەوەی دەرخست كە دەریخست، واتە وتنی قورئان مخلوق ـە).

: لەو سەردەمەدا نوێژی جومعە لەو مزگەوتە كراوە كە خەلیفەی لێبووە، یان لەو چەند مزگەوتەی خەلیفە دیاری كردوون، دوای ئەوەی كە المأمون وتنی قورئان مخلوق ـەی دەرخست ئیمام یحیی بن معین نوێژەكانی لە دواوە گێڕاوەتەوە، چونكە كافر بووە. بەڵام ئەو كۆمەڵەیەی هەر كە ناوی تەوحید ـت هێنا تەنها تەكفیركردنی دەسەڵاتدار و حوكومەتەكانی بە مێشكدا دێت بە هەموو شێوازێك بەرگری لە المأمون ئەكەن.

بلّێ المأمون ووتوویەتی قورئان مخلوق ـە و خەڵكی پێ تاقیكردووەتەوە و زانایانی ئەهلی سوننەی كردووتەوە سجن و هەندێكیان لە سجندا مردوون و . . . هتد، كەچی بە هەموو شێوازێك خۆی گومڕا ئەكات بۆ بەرگریكردن لەم دەسەڵاتدارە كافرە.

بەڵام بلّی المأمون لە جیاتی ئەوەی دەستی دز ببڕێت سجنی ئەكات، ئیتر المأمون ئەبێت بە گەورەترین دوژمنی و ئەوەی المأمونیش تەكفیر نەكات بە كافری ئەزانێت و حساب بۆ ئەثەری كفر دون كفر هەر ناكات، وە وا ئەزانێت تەوحید تەنها تەكفیركردنی المأمون ـە.

جا ئەمەش بەهۆی ئەوەیە كە دوور لە كتێب و مەنهەجی سەلەف .

https://t.me/Ktebxanay_salaf1/149

https://workupload.com/file/xfWPn5nz4FW

**٢٨ - محمد بن يوسف الفريابي** وتى : (ئه‌وه‌ى بلێت قورئان مخلوق ه كافره) .

## باب : (٢)

## وتەی زانایان لە قورئاندا، وە ئەوانەی لێیانەوە بۆمان پارێزراوە کە فەرموویانە : (قورئان کەلامی الله یە عز وجل مخلوق نییە)



(لەم باب ـەدا ئیمام چەند فەرموودەیەک، وە چەند ئەثەرێک لە هاوەڵانەوە ئـەهێنێت دەربارەی ئەوەی قورئان کەلامی الله عز وجل و ئەوەی کە لە موسحەفەکاندا نووسراوە و ئـەخوێندرێتەوە کەلامی الله عز وجل ـە، پاشان وتەی چەندین ئیمامی سەلەف ئـەهێنێت کە وتوویانە (قورئان کەلامی الله یە و غیر مخلوق ـە).

ئـەمێنێتەوە بڵێین پێش دەرکەوتنی فیتنەی جەهم بن صفوان تەنها وتراوە (قورئان کەلامی الله یە)، بەڵام پاش دەرکەوتنی فیتنەی جەهم زانایانی سەلەف رحمهم الله لەگەڵیشیدا فەرموویانە (غیر مخلوق ـە).

ئـەمە پێی ئـەوترێت تەحقیقی سیفەت، واتە سیفەتەکانی الله تعالی مانایەکیان هەیە، هەرکاتێک کەسێک هات هەمان قسەی ئـەهلی سوننەی کرد بەڵام بە مانایەکی تر ئەوە زانایانی سەلەف هاتوون سیفەتەکەیان ڕوونکردووەتەوە بۆ ئەوەی جیاوازی هەبێت لە نێوان جەهمیەکان و موسوڵمانان.

بۆ نمونە جاری وا هەیە ئەبینیت زانایانی ئەهلی سوننە ئەڵێن (الله لەسەر عەرشە بە ذاتی خۆی)، بەس پێشتر وشەی (ذات) بەکارنەهێنراوە، کەواتە بۆچی لە دواتردا بەکارهاتووە ؟

لەبەر ئەوەی دواتر جەهمیەکان ئەیانوت (الله لەسەر عەرشە)، لە ڕووکەشدا هەمان قسەی موسوڵمانیان ئەکرد بەڵام ئەگەر لێت بپرسینایە ئەیانوت (لەسەر عەرشە بە ڕەحمەتی خۆی) یان (بە قودرەتی خۆی)، هەربۆیە زانایان هاتن وتیان (لەسەر عەرشە بە ذاتی خۆی) بۆ ئەوەی جیاوازی نێوان موسوڵمانان و جەهمیەکان دەربکەوێت .

لە بەشێک لە ئەثەرەکاندا هاتووە کە ئەڵێن (قورئان کەلامی الله یە عز وجل، غیر مخلوق ە) .

لە هەندێکی تریشدا ئەڵێن (قورئان کەلامی الله یە عز وجل، هەر شتێک لە الله عز وجل بێت ئەوە مخلوق نییە، یان هیچ شتێک لە الله تعالی مخلوق نییە) .

ئەو ئیمامانە بەم ڕوونکردنەوە کورتە ئەیانەوێت یاسایەک دروست بکەن و بڵێن کە وتمان قورئان کەلامی الله یە کەواتە غیر مخلوق ە، چونکە هیچ شتێکی الله مخلوق نییە .

تۆ مرۆڤیت، هەموو شتێکی تۆ الله تعالی دروستی کردووە، ئایا تۆ ئەتوانیت بڵێیت فلانە شتی من مخلوق نییە ؟

بێگومان نەخێر چونکە خۆت لە ئەسڵدا مخلوق یت، کەواتە هەموو شتێکیشت مخلوق ە، وە الله عز وجل خالق ە و مخلوق نییە، ناوی هەیە و

سیفاتی هەیە، ئەم ناو و سیفاتانەش ناو و سیفاتی الله تعالی ـن، هەربۆیە ناو و سیفاتەکانی مخلوق نین .

ئەگەر کەسێک بڵێت کەلامی الله مخلوق ـە ئەوە کافرە، بۆ؟

لەبەر ئەوەی بە قسەکەی ئەو بێت الله قسەی نەکردووە دواتر قسەی بۆ خۆی دروستکردووە، یان ئەگەر کەسێک بڵێت عیلمی الله تعالی دروستکراوە ئەوە کافر و جەهمیە، چونکە بە قسەی ئەو بێت الله تعالی والعیاذ بالله جاهیل و نەزان بووە پاشان عیلمی بۆ خۆی دروست کردووە، بەم شێوەیە نەقس و کەموکورتی ئەدەنە پاڵ الله عز وجل .

جا بۆیە ئەمە (هیچ شتێکی الله تعالی مخلوق نییە) بکە یاسایەک بۆ هەموو سیفاتەکانی دیکەی الله عز وجل بارک الله فینا و فیک) .



**٢٩** - عبدالله بن الإمام أحمد ئەڵێت : عبدالله بن عمر ناسراو بە مُشكَدانة پرسیاری لە **باوکم** کرد رحمە الله دەربارەی قورئان ؟

وتی : (کەلامی الله یە عز وجل، وە غیر مخلوق ـە) .

**٣٠** - **الحسين بن إبراهيم بن إشكاب** چەندین جار وتی : (قورئان کەلامی الله یە عز وجل غیر مخلوق ـە، وە هەرکەسێک بڵێ مخلوق ـە ئەوە کافرە) .

٣١ - هارون الفروي وتی : (قورئان کەلامی الله یە عز وجل و غیر مخلوق ە).

٣٢ - عبدالوهاب الوراق وتی : (قورئان کەلامی الله یە عز وجل و غیر مخلوق ە).

٣٣ - سفیان بن وکیع بن جراح وتی : (قورئان کەلامی الله یە عز وجل و غیر مخلوق ە).

٣٤ - إبن أبي مُليكة ئەڵێت : عكرمة بن أبي جهل رضي الله عنه موسحەفی ئەگرت و لەسەر دەموچاوی دایئەنا و ئەیفەرموو : (وتەی پەروەردگارم، وتەی پەروەردگارم عز وجل).

: واتە ئەوەی لە موسحەفدا نووسراوە و ئەخوێنرێتەوە کەلامی الله یە و غیر مخلوق ە.

٣٥ - فروة بن نوفل الأشجعي وتی : دراوسێی خباب بووم رضي الله عنه، ڕۆژێکیان لە مزگەوت ڕۆیشتینە دەرەوە و دەستی گرتبووم، وتی : (یا هناه نزیک ببەرەوە لە الله عز وجل ئەوەندەی ئەتوانیت، چونکە نزیک نابیتەوە بە شتێک خۆشەویستر بێت لەلای لە کەلامەکەی - واتە : قورئان).

٣٦ - عائشة رضي الله عنها فەرمووی : (سوێند بە الله باوەڕم نەدەكرد الله لەبارەی - داوێنپاكی - من وەحیەک بنێرێتە خوارەوە بخوێنرێتەوە، وە من خۆم لەوە بە كەمتر ئەزانم الله بە قورئان لە بابەتێكی تایبەت بە من قسە بكات . . . ).

**: لێرەدا دایكە عائشة رضي الله عنها باسی ئەو ڕووداوە ئەكات كە تۆمەتیان بۆ هەڵبەست بە داوێنپیسی، دواتر الله تعالی پاكێتی سەلماند لە قورئاندا، جا لێرەدا ئەڵێت : (خۆم لەوە بە كەمتر ئەزانم الله بە قورئان لە بابەتێكی تایبەت بە من قسە بكات) سەلماندی كە الله تعالی قسە ئەكات، واتە سیفەتی قسەكردنی هەیە، وە سەلماندی كە قورئان قسە و كەلامی الله تعالی یە.**

**وە ئەڵێت : (وەحیەک بنێرێتە خوارەوە بخوێنرێتەوە) واتە ئەوەی كە جبريل عليه السلام لە وەحی هێناویەتیە خوارەوە بۆ رسول الله ﷺ هەمان ئەو كەلام و قسەیەیە كە الله تعالی قسەی پێ كردووە، وە ئەوەی كە ئێمەش ئەیخوێنینەوە هەمان كەلامی الله تعالی یە، وە كەلامی الله تعالی ش غیر مخلوق ـە .**

٣٧ - نیار بن مكرم وتی : أبو بكر رضي الله عنه هەواڵی دا بە كۆمەڵەیەک لە خەڵكی مەككە كە ڕۆمەكان بەسەر فارسەكاندا سەرئەكەون، جا فارسەكان سەركەوتن بەسەر ڕۆمەكاندا، ئەمە دابەزی | الٓمٓ (١) غُلِبَتِ ٱلرُّومُ (٢) فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ (٣) | (الرُّومِ) .

أبو بكر هات بەسەر قوڕەیشیەكاندا خوێندیەوە .

ئەوانیش وتیان : وتەی خۆتە یان هی هاوەڵەكەتە - واتە رسول الله ﷺ - ؟

فەرمووی : (نە وتەی خۆمە وە نە وتەی هاوەڵەکەمە، بەڵکو قسەی الله وتەی الله عز وجل ـە).

**٣٨ - عمر بن الخطاب** رضي الله عنه فەرمووی : (ئەم قورئانە کەلامی الله عز وجل ـە، جا با نەزانم بەپێی هەوا و ئارەزووتان لێکی ئەدەنەوە).

**٣٩ - عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه فەرمووی : (قورئان کەلامی الله یە عز وجل، جا هەرکەسێک یەک شتی ڕەتبکاتەوە ئەوە ڕەددی الله عز وجل ئەداتەوە).

**٤٠ - رسول الله ﷺ** فەرمووی : (**باشترین کەلام کەلامی الله یە عز وجل**).

**٤١ - عثمان بن عفان** رضي الله عنه فەرمووی : (حەز ناکەم یەک شەو و ڕۆژ بەسەرمدا تێبپەڕێت ئیللا تەماشای کەلامی الله بکەم عز وجل).

واتە : خوێندنەوە لە موسحەفدا.

**٤٢ - محمد بن كعب القرظي** وتی : (کاتێک لە قیامەتدا خەڵکی گوێبیستی قورئان ئەبن لە دەمی الرحمن ـەوە عز وجل وەکو ئەوە وایە پێش ئەوە گوێیان لێ نەبووبێت).

٤٣ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (فەزڵی قورئان بەسەر وتەكانی تردا وەكو فەزڵی الله عز وجل وایە بەسەر بەندەكانیدا) .

٤٤ - عبدالله بن مسعود رضي الله عنه فەرمووی : (هەركەسێک پێی خۆش بوو بزانێت ئاخۆ الله عز وجل ی خۆشئەوێت، ئەوە با خۆی بپێوێت بە قورئان، ئەگەر قورئانی خۆشویست ئەوە الله عز وجل ی خۆشئەوێت، چونكە قورئان كەلامی الله عز وجل ـە)

٤٥ - سليمان بن عبدالملک وتی : (فەزڵ و گەورەیی قورئان بەسەر وتەكانی تردا، وەكو فەزڵی دروستكەر وایە بەسەر دروستكراوەكانیدا) .

٤٦ - عبدالله ئەڵێت : گوێبیستی باوكم بووم رحمه الله وتی : (هەركەسێک كە فەرموودەوان بێت یان ئەهلی كەلام بێت و خۆی بگرێتەوە لەوەی بڵێت : (قورئان غیر مخلوق ـە)، ئەوە جەهمیە) .

٤٧ - معاوية بن عمار الدهني وتی : وتم بە جعفر بن محمد : ئەوان پرسیارمان لێ ئەكەن دەربارەی قورئان داخۆ مخلوق ـە ؟

وتی : (نە خالق ـە، نە مخلوق، بەڵكو كەلامی الله یە) .

٤٨ - الزهري وتی : پرسیارم كرد لە علي بن الحسين - واتە زين العابدين - دەربارەی قورئان ؟

وتی : (کتێبی الله عز وجل و کەلامەکەیەتی ) .

**٤٩** - عبدالله ئەڵێت : گوێبیستی **باوکم** بووم رحمه الله وتی : پێم گەیشتووە لە إبراهيم بن سعد و، سعيد بن عبدالرحمن الجمحي و، وهب بن جرير و، أبي النضر هاشم بن قاسم و سليمان بن حرب وتوویانە : (قورئان کەلامی الله یە غیر مخلوق ە ) .

**٥٠** - **عبدالله بن المبارک** وتی : (قورئان کەلامی الله یە عز وجل نە خالق ە، نە مخلوق، بەڵکو کەلامی الله یە ) .

**٥١** - **إسماعيل بن أبي أويس** وتی : (گوێبیستی خاڵم مالک بن أنس و کۆمەڵە زانایەکی مەدینە بووم باسی قورئانیان کرد و وتیان : قورئان کەلامی الله یە عز وجل، وە لە خۆیەتی، وە هیچ شتێکی الله عز وجل مخلوق نییە ) .

**٥٢** - **حماد بن زيد** وتی : (قورئان وتەی الله عز وجل ە، جبريل عليه السلام لەلای رب ی العالمین ەوە عز وجل هێناویەتی ) .

---

**: ئەو قورئانەی کە الله عز وجل قسەی پێ کردووە و جبريل عليه السلام لێوەی بیستووە و رسول الله ﷺ لە جبريل ەوە بیستوویەتی و هاوەڵانی لە رسول الله بیستوویانە و لە موسحەفدا نووسراوەتەوە و ئەخوێنرێتەوە و خەڵکی لەبەری ئەکەن ئەوە کەلامی الله یە عز وجل وە غیر مخلوق ە، بە پێچەوانەی هەموو تاقمە جەهمیەکان .**

٥٣ - محمد بن عثمان وتی : گوێبیستی عبدالرحمن بن مهدي بووم و سهل بن أبي خدويه پرسیاری لێکرد دەربارەی قورئان ؟

عبدالرحمن وتی : ئەی باوکی یحیی، ئیشت چییە بەم بابەتانە ؟ ئەمانە بابەتی هاوەڵانی جەهم ە، بەڕاستی هیچ خاوەن هەوا و ئارەزوویەک خراپتر نین لە هاوەڵانی جەهم، لە دەوری ئەوە ئەسووڕێنەوە بڵێن لە ئاسمان هیچی لێ نییە، پێم وایە کە نابێت هاوسەرگیریان لەگەڵدا بکرێت و میراتیان وەربگیرێت ).

---

**: وتەکانی ئیمام عبدالرحمن بن المهدي چەند سوودێکی تێدایە :**

**یەکەم : وتەی (بەڕاستی هیچ خاوەن هەوا و ئارەزوویەک خراپتر نین لە هاوەڵانی جەهم)، واتە لە خراپترینی بیدعەچی و گومڕا و کافرەکان بریتین لە جەهمیەکان، جا بۆیە هەرکاتێک سەلەف بە کەسێکیان وتبێت جەهمی ئەوە خراپترین شتیان پێ وتووە و تەکفیریان کردووە .**

**دووەم : وتەی (لە دەوری ئەوە ئەسووڕێنەوە بڵێن لە ئاسمان هیچی لێ نییە)، واتە دان نانێن بەوەی کە الله عز وجل لەسەر عەرشە، وە جەهمیە کۆنەکان لەبەر توندی سەلەف لەسەریان نەیاندەوێرا بە ئاشکرا بڵێن الله عز وجل لەسەر عەرش نییە، بەڵکو لە قسەکانیان ئەوە ئەخوێنرایەوە، بەڵام غولاتی جەهمیەکان کە ئەشعەریە کافرەکانن بە ئاشکرا ئەڵێن الله تعالى بە ذاتی خۆی لەسەر عەرش نییە، وە ئەو کەسەش بە کافر ئەزانن کە پێی وایە الله عز وجل لەسەر عەرشە، هەربۆیە ئەشعەریە جەهمیەکان کافرترن لە جەهمیەکانی سەرەتا .**

**سێیەم : وتەی (پێم وایە کە نابێت هاوسەرگیریان لەگەڵدا بکرێت و میراتیان وەربگیرێت)، ئەم وتەیە تەکفیرکردنی تەواوی جەهمیەکانە، لێرەدا ئیمام دانە بە دانەیان**

تەكفير ئەكات، هەر لەبەر ئەوەشە ئەڵێت هاوسەرگیریان لەگەڵ ناكرێت و میراتیان وەرناگیرێت، ئەمەش بابەتی تەكفیركردنی جەهمیەكان لەدوای ئیقامە حوججە بەتاڵ ئەكاتەوە، چونكە ئیمام كە ئەو قسەیە ئەكات نازانێت ئایا ئیقامە حوججەیان لەسەر كراوە یان نا، وەكو ئەوە وایە بڵێیت نابێت هاوسەرگیری لەگەڵ عەلمانی یان گۆڕپەرستەكاندا بكرێت، ئەم قسەیەش تەكفیركردنی دانە بە دانەی عەلمانی و گۆڕپەرستەكانە، چونكە تۆ نەت وت ئەبێت ئیقامە حوججەیان بكەین ئەگەر هەر لەسەر كوفرەكەیان بەردەوام بوون ئینجا هاوسەرگیریان لەگەڵ ناكرێت، بەڵكو ڕاستەوخۆ بەبێ زانینی حاڵیان تەكفیری كردن.

٥٤ - أبو نعيم الفضل بن دكين وتی : (قورئان وتەی اللە یە عز وجل غیر مخلوق ە ) .

٥٥ - عبدالرحمن بن مهدي وتی : (قورئان كەلامی اللە یە، نە خالق ە وە نە مخلوق ە ) .

٥٦ - وكيع بن الجراح وتی : (قورئان وتەی اللە یە عز وجل، غیر مخلوق ە ) .

٥٧ - بشر بن الحارث وتی : پرسیارم كرد لە عبدالله بن داود دەربارەی قورئان ؟

وتی : (ئایا ئەمە | الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ | (الحشر : ٢٣) مخلوق ە ؟ ) .

٥٨ - هشام بن عبدالملک وتی : يحيى بن سعيد القطان پێی وتم : (چی ئەکەن لەمانە | قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ | (الإخلاص : ١) .

| إِنِّيٓ أَنَا ٱللَّهُ | (القصص : ٣٠)، ئایا ئەمانە مخلوق ـن ؟!) .

٥٩ - وهب بن جرير وتی : (قورئان وتەی الله یە عز وجل، وە غیر مخلوق ـە) .

٦٠ - يزيد بن هارون وتی : (قورئان وتەی الله یە عز وجل، وە غیر مخلوق ـە) .

٦١ - محمد بن يزيد الواسطي وتی : (زانستەکەی و وتەکەی لە خۆیەتی، وە غیر مخلوق ـە) .

٦٢ - إبن أبي أويس وتی : (قورئان کەلامی الله یە، وە لە الله یە، وە هەر شتێک لە الله عز وجل بێت ئەوە مخلوق نییە) .

٦٣ - عبدالله ئەڵێت : گوێبیستی أبو بكر بن أبي شيبة بووم کاتێک یەکێک لە هاوەڵانی وتی : قورئان وتەی الله یە، وە غیر مخلوق ـە .

أبو بكر وتی : (هەرکەسێک وا نەڵێت ئەوە گومڕایەکی گومڕاکەری بیدعەچیە) .

٦٤ - **عثمان بن أبي شيبة** وتی : (قورئان وتەی الله یە، وە غیر مخلوق ە ) .

٦٥ - **أبو عمرو الشيباني** وتی : إسماعیل بن حماد بن أبي حنیفة وتی : قورئان مخلوق ە .

پێم وت : (ئایا پێش قسەكردن پێی دروستی كرد، یان دوای ئەوەی قسەی پێ كرد ؟) .

جا بێدەنگ بوو .

---

: إسماعیل بن حماد بن أبي حنیفة نەوەی ئەبو حەنیفەیە، ئەبو حەنیفەی باپیری دووجار لەسەر وتنی قورئان مخلوق ە و جەهمیەت تۆبەی پێكراوە .

٦٦ - **يحيى بن أيوب** وتی : (هەركەسێک نەڵێت قورئان كەلامی الله یە عز وجل وە غیر مخلوق ە، ئەوە جەهمیە ) .

٦٧ - **محمد بن سليمان لُوَين** وتی : (قورئان كەلامی الله یە غیر مخلوق ە، هیچ كەسێكم نەبینیوە - **واتە لە سەلەف** - بڵێت (قورئان مخلوق ە)، پەنا ئەگرم بە الله ) .

٦٨ - عطاء ی برازای حجاج الأنماطي وتی : به **حجاج** ی مامەم وت : چی ئەڵێیت دەربارەی قورئان ؟

وتی : (قورئان کەلامی الله عز وجل ە ، وە هیچ شتێک ی الله مخلوق نییە).

٦٩ - **سوار بن عبدالله القاضي** وتی : (سەردانی پیاوێکم کرد لەبەر ئەوەی ئازارێکی هەبوو، وتی : قورئان مخلوق نییە، چونکە هەموو ئەوانەی کە پەنایان داوم ئەیانوت : پەنات ئەدەم بە الله، پەنات ئەدەم بە قورئان .

جا زانیم قورئان مخلوق نییە .

٧٠ - **يحيي بن معين** و **أبي خيثمة** وتیان : (قورئان کەلامی الله یە، وە مخلوق نییە ) .

٧١ - **يحيى بن معين** وتی : گوێبیستی إسحاق بن أبي إسرائيل بووم کاتێک لە مزگەوت بووین لە الزبيدية وتی : (قورئان کەلامی الله یە عز وجل، وە غیر مخلوق ە ) .

٧٢ - **أبو معمر** وتی : (قورئان کەلامی الله یە عز وجل، وە مخلوق نییە، وە هەر کەسێک گومانی هەبێت لەوەی کە غیر مخلوق ە ئەوە جەهمیە، نەخێر بەڵکو خراپترە لە جەهمی ) .

٧٣ - **أبو معمر** وتی : (گەیشتم بە خەڵكی ئەیانوت : قورئان كەلامی الله یە عز وجل، وە مخلوق نییە) .

## باب : (٣)

## پرسیاری لێکرا دەربارەی ئەو کەسەی ئەڵێت : (لفظ م بە قورئان مخلوق ە)، وە وتەی أبو عبدالله دەربارەی الواقفة کان



(الواقفة کان کۆمەڵەیەکی ترن لە جەهمیەکان کە وتیان ئێمە نە ئەڵێین قورئان مخلوق ە، وە نە ئەڵێین غیر مخلوق ە .

مەبەستیان لەمە ئەوەبوو بە ناڕاستەوخۆیی بڵێین قورئان مخلوق ە، چونکە هەموو شتێک یان مخلوق ە یان غیر مخلوق، الله تعالی و سیفەت و ناوەکانی هەموویان غیر مخلوق ن، دروستکراوەکانیش هەموو شتێکیان مخلوق ە .

اللفظیة کان کۆمەڵیەکی ترن لە جەهمیەکان کە وتیان قورئان مخلوق ە بەڵام بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بە بەکارهێنانی (لفظ م بە قورئان مخلوق ) ە، وتەی لفظ دوو شت ئەگرێتەوە :

یەکەم : کەلامی الله، واتە قورئان .

دووەم : کار و کردەوەی بەندەکە .

جا جەهمیەکانی سەرەتا پاش ئەوەی لە فیتنەی خەلقی قورئاندا ڕووی ڕەشیان ئاشکرا بوو، وە دەسەڵات و خەلیفەکان لە پشتیان نەمان، ناچاربوون دوو کوفری تازە دابهێنن بۆ شاردنەوەی وتە کوفرکەیان، هاتن دوو شتیان داهێنا.

یەکەم : وەستان لە قورئاندا بەوەی نە بڵێیت مخلوق ـە نە غیر مخلوق .

دووەم : وتنی (لفظ ـم بە قورئان مخلوق ـە) .

ئەم وتەیانە بە وردی بخوێنەرەوە لە مەبەستی اللفظية و الواقفة ـەکان تێئەگەیت بإذن الله :

- ئیمام احمد وتی : (جەهمیەکان بوون بە سێ فرقە، ئەوانەی وتیان قورئان مەخلوقە، وە ئەوانەی گومانیان هەبوو کە قورئان غیر مەخلوق بێت (واتا الواقفة)، وە ئەوانەی ووتیان لەفزمان بە قوڕئان مەخلوقە) .

وە وتی : (ناڵێن ئەمانە واقفەن، پێیان ئەڵێین (شكاكة) واتا گومانیان هەیە قوڕئان غەیر مەخلوق بێت) .

(السنة للخلال : ١٧٦٦)

- ئیمام احمد وتی : (جەهمیەکان سێ جۆرن :

فرقەیەکیان ووتیان قورئان مەخلوقە .

فرقەیەکیان ووتیان قورئان کەلامی الله یە، وە ئەوەستین .

وە فرقەیەکیان ووتیان لەفزمان بە قورئان مەخلوقە .

لەلای من هەر سێ فرقەکە هەمان ووتەیان هەیە) .

(السنة للخلال : ١٧٦٧)

کە ئەڵێت لەلای من هەرسێکیان یەک وتەیان هەیە، واتا هەر سێکیان مەبەستیان ئەوەیە بڵێن قورئان مەخلوقە، بەڵام فرقەی دووەم و سێیەم بە ڕێگای فێڵاوی و شاراوە ئەم کوفرە ئەکەن، بۆیە ئەبینین سەلەف کۆکن لەسەر ئەوەی کە هەر سێ فرقەکە جەهمین و کافرن چونکە زانیویانە مەبەستیانە بڵێن قورئان مەخلوقە بەڵام لە ڕێگایەکی ناڕاستەوخۆ .

- الحسن بن ثواب المخرمي ئەڵێ: بە ئیمام احمدم ووت: الواقفة ؟ (واتا حوکمیان چیە)

ووتی: بەشێکن لە جەهمیەکان، بە وەقف کردن کوفرەکەیان شاردووەتەوە .

**(السنة للخلال : ١٧٧١)**

هەر بۆیە سەلەف دەربارەی حوکمی واقفی و لەفزی تەفسیل ئەدەن ئەڵێن گەر ئەهلی کەلام بوو جەهمیە، بەڵام گەر عەوام و نەزان بوو ئەوا فێر ئەکرێت، بەڵام دەربارەی حوکمی ئەوەی ئەڵێ قورئان مەخلوقە تەفسیل نادەن و تەکفیری ئەکەن جا هەر کەسێک بێت و هەر حاڵێکی هەبێت، چونکە فرقەی یەکەم کوفرەکەی ڕوونە، بەڵام فرقەی دووەم و سێیەم کوفرەکەیان بە ناڕاستەوخۆ دەرئەبڕن بە ڕاشکاوی ناڵێن قورئان مەخلوقە، بۆیە سەلەف ئەم تەفسیلە ئەدەن بە حوکمی ئەوان چونکە ڕەنگە کەسێک هەمان قسەی ئەوان بکات و هەمان مەبەستی ئەوانی نەبێت .

- عبداللە ئەڵێ : پرسیار لە باوکم کرا رحمه الله دەربارەی لەفزییە و واقفە، منیش ئەم بیست، باوکم وتی: هەر کەسێک لەوان عیلمی کەلام ئەزانێت ئەوا

جەهمیە، وە جارێکیان ووتی ئەوان لە جەهمیەکان خراپترن، وە جارێکی تر ووتی ئەوان جەهمین.

**(السنة لعبدالله : ١٦٩)**

جەهمی بوونیانی پەیوەست کرد بەوەی کە ئەهلی کەلامن یان نا، چونکە ئەهلی کەلام بۆ ئەوەی بڵێن قورئان مەخلوقە ووتیان توقف ئەکەین یان ووتیان لەفزمان مەخلوقە بە قورئان .

هەر بۆیەش ئەبینین ئیمام احمد دەربارەی واقفە ووتی پێیان ئەڵێین (شكاكة) واتا گومانیان هەیە کە قورئان مەخلوق نەبێت، هەر کەسێکیش گومانی هەبێت لەوەی کەلامی الله مەخلوق نیە ئەوا کافرە، وە لە شوێنێکی تر وتی ئەمانە بەشێکن لە جەهمیەکان بە وەقف کردن کوفرەکەیان شاردووەتەوە، واتا ئەوانیش بڕوایان وایە قورئان مەخلوقە بەڵام بەم وەقف کردنە کوفرەکەیان ئەشارنەوە و دەری نابڕن .

- وە دەبینین ئیمام احمد دەربارەی لەفزییە ئەڵێت :

هەر کەسێک بەرەو قورئان بچێت بە بابەتی لەفز یان بەهەر شتێکی تر، مەبەستی ئەوە بێت کە قورئان مەخلوقە ئەوا جەهمیە .

**(السنة لعبدالله : ١٦٧)**

واتا عیللەتی تەکفیر کردنیان ئەوەیە بڕوایان وایە قورئان مەخلوقە، بەڵام ناڕاستەوخۆ ئەم کوفرە دەرئەبڕن بە وشەی تەم و مژاوی) .



٧٤ - عبدالله بن الإمام أحمد وتی : پرسیارم كرد لە باوكم رحمه الله : چی ئەڵێیت دەربارەی پیاوێک كە تووبەتی : التِّلاوة مخلوق ـە، وە لفظ ـەكانمان بە قورئان مخلوق ـە، وە قورئان كەلامی الله یە و مخلوق نییە، چی ئەڵێیت دەربارەی هەجر كردنی ؟ وە ئایا پێی ئەوترێت بیدعەچی ؟

وتی : (ئەمە هەجر ئەكرێت، وە ئەوە وتەیەكی داهێنراوە، وە ئەوە وتەی جەهمیەكانە، قورئان مخلوق نییە ) .

٧٥ - وە وتی : إبن شبویه بۆی گێڕامەوە وتی گوێبیستی باوكم بووم وتی : (هەر كەسێک بڵێت شتێک لە الله عز وجل مخلوق ـە، وەک عیلمەكەی یان كەلامەكەی، ئەوە زەندیقێكی كافرە، نوێژی لەسەر ناكرێت، وە نوێژی لەپشت ناكرێت، وە پارەكەی وەكو پارەی مورتەد حسابی بۆ ئەكرێت ) .

٧٦ - وە وتی : پرسیارم كرد لە باوكم رحمه الله : دەربارەی كۆمەڵەیەک كە ئەڵێن (لفظ ـمان بە قورئان مخلوق ـە )؟

وتی : (ئەوانە جەهمین، وە لەوانە خراپترن كە ئەوەستن، وە ئەوە وتەی جەهمیەكانە ) .

ئەو بابەتەی زۆر لەلا گەورە بوو، وە وتی : (ئەمە وتەی جەهمە ) .

٧٧ - وە وتی : پرسیارم لێكرد دەربارەی ئەو كەسەی ئەڵێت لفظ ـم بە قورئان مخلوق ـە ؟

وتی : (اللّه عز وجل ئەفەرموویت : ﴿ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ﴾ (التَّوْبَة : ٦) .

وه پێغەمبەر فەرمووی ﷺ : (بۆ ئەوەی کەلامی پەروەردگارم عز وجل بگەیەنم) .

٧٨ - وه وتی : گوێبیستی باوکم بووم رحمه الله وتی : (ئەوەی بڵێت لفظ م به قورئان مخلوق ە ئەوە جەهمیه) .

٧٩ - وه وتی : پرسیار کرا له باوکم رحمه الله منیش گوێبیستی بووم دەربارەی اللفظية ؟

وتی : (ئەوانە جەهمین ، وه ئەوە وتەی جەهمە) .

پاشان وتی : (لەلایان دانەنیشن) .

٨٠ - وه وتی : گوێبیستی باوکم بووم وتی : (هەر کەسێک بەرەو قورئان بڕوات به لفظ یان به شتێک بێجگە لەوە مەبەستی پێی مخلوق بێت ، ئەوە جەهمیە) .

٨١ - وه وتی : پرسیار کرا له باوکم رحمه الله منیش گوێبیستی بووم دەربارەی اللفظية و الواقفة ؟

وتی : (هەریەکێک لەوان کە نەزان بێت با پرسیار بکات و فێرببێت) .

**٨٢** - وە وتی : پرسیار كرا لە **باوكم** رحمە الله منیش گوێبیستی بووم دەربارەی اللفظیة و الواقفة ؟

وتی : (هەریەكێك لەوان لە الكلام بزانێت ئەوە جەهمیە) .

**٨٣** - وە وتی : گوێبیستی **باوكم** بووم رحمە الله وە پرسیاری لێكرا دەربارەی الواقفة .

باوكم وتی : (هەركامێكیان كە دەمە دەمێی ئەكرد و ناسرابوو بە الكلام، ئەوە جەهمیە، وە ئەوەی ناسراو نەبێت بە الكلام هەجر ئەكرێت هەتا ئەگەڕێتەوە .

وە ئەوەی زانیاری نەبێت ئەوە پرسیار ئەكات و فێر ئەبێت) .

**٨٤** - وە وتی : گوێبیستی **باوكم** بووم وتی : (هەركەسێک بڵێت لفظ م بە قورئان مخلوق ە، ئەوە قسەیەكی خراپ و بێزراوە، وە ئەوە قسەی جەهمیەكانە) .

پێم وت : الكرابیسي وا ئەڵێت .

وتی : (درۆ ئەكات، الله ڕسوای بكات، ئەو پیسە، بشر المریسي ئەمەی لە دوای خۆی بەجێهێشت) .

وە باوكم ڕقی لەوە بوو لە لفظ دا قسە بكات بە هیچ شتێک، نە بووترێت مخلوق ە، نە غیر مخلوق ە .

**٨٥** - وە وتی پرسیارم کرد لە **أبو ثور** دەربارەی حسين الكرابيسي ؟

جا قسەی دەربارەی کرد بە قسەکردنێکی خراپ **- واتە وتی خراپە -** .

## باب : (٤)

## ئەوەی كە پاراستوومە و نووسیومە دەربارەی جەهم، وە بشر المريسي



(لەم بەشەدا ئیمام دێت وتەی زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە لە سەلەف ئەهێنێت بۆ وەسفکردنی یەکێک لە دووکافرترین کەسەکان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، ئەوانیش جهم بن صفوان و بشر بن غياث المريسي، ئەم دوو کەسە ئیجماعی هەموو سەلەف هەیە لەسەریان کە کافرن، الله تعالى خۆیان و شوێنکەوتووەکانیان بخاتە بەشی هەرە ژێرەوەی جەهەننەم، شایەنی باسە کە خودی جەهمیەکانی سەرەتا و موعتەزیلەکان و کوللابیەکان و ئەشعەریەکان و ماتوریدیەکان شوێنکەوتەی بەحەقی جهم بن صفوان ـن).



٨٦ - يزيد بن هارون وتی : (لەعنەتی الله لە جهم بێت، وە هەرکەسێک هەمان قسەی ئەو ئەکات، کافرێکی نکۆڵیکەر بوو، چل ڕۆژ وازی لە نوێژکردن هێنا، ئەیویت بە بەدوای دینێکدا ئەگەڕێت، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە شک و گومانە بۆ دروست بوو لە ئیسلام).

٨٧ - أبا نعيم البلخي شجاع بن نصر وتی : گوێم لە هاوەڵێکی جەهم بوو کە هەمان قسەی ئەوی ئەکرد - واتە هەمان عەقیدەی جەهمی هەبوو - ، وە لەوانەبوو زۆر لەگەڵیدابووە، پاشان وازی لێ هێنا و باسی کوفرەکەی کرد وتی : (ڕۆژێکیان بینیم جەهم سورەتی طه ی کردەوە، کە گەیشتە ئایەتی | الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ : الرحمن لەسەر عەرشەکەی بەرز و بڵند بووەتەوە | وتی : ئەگەر ڕێگایەکم بدۆزیایەتەوە سڕینەوەی ئەمە ئەوە ئەمسڕیەوە .

٨٨ - عاصم بن علي وتی : (موناقەشەم لەگەڵ جەهم کرد، جا ئەوەی جێگیر نەکرد لە ئاسمان پەروەردگارێکی لێبێت، پەروەردگاری ئێمە بەرز و بڵند و پیرۆزە) .

---

- الهروي لە ذم الكلام وأهله (٥/١٢٠) ئەڵێت : (فیتنەی نەفیکردنی کەلامی الله یەکەم کەس جعد بن درهم دایهێنا، کاتێک جعد دەرکەوت الزهري - سەرگەورەی زانایانی ئیسلام لەو سەردەمەدا - وتی : جعد لە ئوممەتی محمد ﷺ نییە. پاشان جهم بن صفوان قسەکەی لێ وەرگرت دەعوەی بۆ کرد، جا بوو بە ڕێبازێک و هەتا ئێستاش لەلایەن خەڵکیەوە بانگەوازی بۆ ئەکرێت*) . . . پاشان درێژەی پێ ئەدات و باسی بەقوربانی کردنی جعد بن درهم ئەکات لەلایەن خالد القسري ـەوە کە لە جەژنی قورباندا سەری بڕی. پاشان باسی سەربڕینی جهم بن صفوان ئەکات لەلایەن سلم بن أحوز المازني و ئەڵێت : (لەبەرچاو ئەهلی عیلمدا دای لە ملی و ئەوانیش بە کارێکی باشیان زانی).

* مەبەستی الهروي لە (جا بوو بە ڕێبازێک و هەتا ئێستاش لەلایەن خەڵکیەوە بانگەوازی بۆ ئەکرێت) ئەشعەریەکانە، چونکە الهروي ساڵی ٤٨١ هـ مردووە

- اللالكائي به سەنەدی خۆی له (شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة) ئەیهێنێت له بكير بن معروف ـەوە وتی : بينيم كاتێک سلم الأحوز دای له ملی جەهم دەموچاوی ڕەش بوو - واته دەموچاوی جەهم - ) .

- سعد بن علي الزنجاني (٤٧١ هـ) دەربارەی جهم بن صفوان ئەڵێت :

(ئامادە ئەبوو له مەجليسی ئەبو حەنيفە، پاشان چەند قسەيەكی پيسی داهێنا، لەوانە : زانستی الله مەخلوق ـە، وە كەلامی الله مخلوق ـە، وە الله زانا و قسەكەر نەبووە هەتا زانست و قسەی بۆخۆی دروست كردووە، مەزهەبی جەبر ی داهێنا، الله بەزۆر كوفر و تاوان بە دروستكراوەكانی ئەكات، وە ئیمان زانستی دڵه به بوونی الله بەبێ وته و كردەوە، وە چل و پێنج شەو وازی له نوێژ هێنا، وە بەهەشت و جەهەننەم له كۆتاييدا نامێنن، هەربۆيە ئیماندار به هەتا هەتايی له خۆشگوزانيدا نامێنێتەوە، وە كافرەكانيش به هەتا هەتايی له دۆزەخدا نامێننەوە . . . .

(پاشان ئەڵێت) مەسەلەكەی بەرز كرايەوە بۆلای سلم بن أحوز كه لەلايەن المنصور ـەوە كرابوو به ئەميری عێراق، جا زانايانی كۆكردەوە، پرسياری لێ كرا دەربارەی وتەكانی، دانی نا به هەندێكياندا، پاشان زانايان كه گوێيان كه وتەكانی بوو كۆڕابوون لەسەر ئەوەی كەسێک ئەم شتانه بڵێت و باوەڕی پێی هەبێت مولحيد و بێدينه، جا فەرمانی كرد دەست و قاچەكانی ببڕدرێت و هەڵبواسرێت، پاشان خراپی وتەكانی لەسەر ئوممەت لاچوو هەتا كاتی علي بن إسماعيل الأشعري (ئەبو حەسەنی ئەشعەری) نێوانی لەگەڵ أبي علي الجبائي تێكچوو و دەری كرد له مەجليسەكەی، ئيتر ڕۆيشت بۆ هەندێک وتەی، وە سەريخست و موناقەشەی لەسەر ئەكرد لەگەڵ موعتەزيلەكاندا، پاش ئەوە دووبارە شەڕەكەی هاتەوە سەر ئوممەت) .

## شەرحەكەی بۆ (المنظومة في السنة)

: (جا ڕۆيشت بۆ هەندێک وتەی، وە سەريخست و موناقەشەی لەسەر ئەكرد لەگەڵ موعتەزيلەكاندا) پێشتر ئەبو حەسەن موعتەزيلی بووە، دوای دەركرانی لەلايەن الجبائي مامۆستای ئەبێت به خاوەنی عەقيدەی جەهم و سەريئەخات بەسەر موعتەزيلەكاندا .

**٨٩** - **عبدالله بن المبارك** وتی : (ماڵوێرانی بۆ گەنجەکان، کەسێکیان تێدا نییە بشر بکوژێت!) .

**٩٠** - **شبابة بن سوار** وتی : (بۆچوونی من و أبو النضر هاشم بن القاسم و کۆمەڵێک لە فەقیهەکان کۆبوویەوە لەسەر ئەوەی کە بشر المريسي کافرێکی نکۆڵیکەرە، بۆچوونمان وایە کە تۆبەی پێ بکرێت، ئەگەر تۆبەی نەکرد لە ملی بدرێت) .

**٩١** - عبدالله بن الإمام أحمد ئەڵێت : سوار بن عبدالله القاضي وتی : **عبدالرحمن بن عبدالله بن سوار** وتی : (لەلای سفيان بن عيينة بووم، خەڵکی کەوتنەگیانی بشر المريسي هەتا تێیانهەڵدا، وە وتیان : جەهمی .

وە سفيان بن عيينة پێی وت : (ئەی ئاژەڵ ئەی ئاژەڵ، ئایا گوێبیستی الله عز وجل نەبوویت کە ئەفەرمووێت : ﴿ **أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ** ﴾ (الأعۡرَافِ : ٥٤)، هەواڵی دا عز وجل کە دروستکراو و فەرمانەکەی - **واتە کەلامەکەی** - لەیەک جیان).

وترا بە سوار : ئەی بشر چی وت ؟

وتی : (بێدەنگ بوو، هیچ بەڵگەیەکی پێ نەبوو) .

**٩٢** - پێشەوای ئیمانداران **هارون الرشيد** وتی : (پێم گەیشتووە بشر المريسي ئەڵێت قورئان مخلوق ـە !

سوێند بە الله ئەگەر دەستم پێی بگات بە شێوەیەک ئەیکوژم کە هیچ کەسێکم ئاوا نەکوشتبێت ) .

**٩٣ - إسحاق بن عبدالرحمن** وتی : (بشر المريسي قسەی کرد بە قسەی کۆمەڵێک لە زەندیقەکان ، شێوەیان ئاوا و ئاوا بوو ) .

---

**: زەندیق واتە کەسێک کە لەڕووکەشدا ئیسلام پیشان بدات بەڵام لەناخەوە کافر بێت، لەوانەیە کەسێک بڵێت جا چۆن بزانین ئەوان کافرن لە ناخەوە لەکاتێکدا ئیسلامەتی پیشان ئەدەن ؟**

**بێگومان لەڕێگەی ئەو قسە و کردارانەی کە ئەنجامی ئەدەن دەرکەوێت لەڕاستیدا موسوڵمان نین و کافرن، تەماشای ئەثەری ٩٦ بکە بۆت دەرئەکەوێت .**

**٩٤ - أبو نعيم** وتی : (لەعنەتی الله لە بشر المريسي ی کافر ) .

**٩٥ - عباد بن العوام** وتی : (قسەم لەگەڵ بشر المريسي و هاوەڵانی بشر کرد ، جا بينيم کۆتايی قسەکەيان ئەوەيە کە ئەڵێن هيچ شتێک لە ئاسمان نييە - واتە الله لەسەر عەرش نييە - ) .

---

**: هەموو ئەشعەریەکانیش وەکو جەهمیەکان پێیان وایە الله تعالی لەسەر عەرش نییە.**

**٩٦ - يحيى بن أيوب** وتی : گوێم لێبوو خەڵكی قسەیان ئەكرد دەربارەی بشر المريسي، منیش پێم خۆش نەبوو قسەی پێ بڵێم هەتا گوێم لە وتەكانی ئەبێت، بۆ ئەوەی بە زانستەوە قسەی دەربارە بكەم، جا ڕۆیشتم بۆ لای، صەلاواتی زۆر لێئەدا بەسەر عیسی ی كوڕی مریم علیه السلام .

جا پێم وت : تۆ زۆر صەلاوات لێئەدەیت بەسەریدا، ئەویش شایەنیەتی، وە نابینم صەلاوات لێبدەیت بەسەر پێغەمبەری خۆماندا، لەكاتێكدا پێغەمبەری خۆمان باشترە لەو .

پێی وتم : (ئەو هەر خەریكی ئاوێنە و شانە و ژن بووە ! ) .

**٩٧ - إبن الماجشون** ئەڵێت : (ئەگەر المريسي م بەردەست بكەوتایە ئەمدا لە ملی ) .

**٩٨ - يحيى بن أبي قطيفة السراج** ئەڵێت : لەلای سفيان بن عيينة بووین، خەڵكی بە سەغڵەتی هاتن بۆ لای، إبن عيينة وتی : (چی بووە ؟) .

وتیان : بشر هات .

وتی : (ئەی چی ئەڵێت ؟ ) .

وتیان : ئەڵێت قورئان مخلوق ە .

وتی : (بۆم بهێنن لەگەڵ دووشایەتدا هەتا فەرمان بكەم بە والی لە ملی بدات ) .

١٧٠٦ - المروذي ئەڵێت گوێم لە أبا عبدالله (ئیمام أحمد) بوو وتی : (الله گۆڕی المریسي پڕ بکات لە ئاگر) .

١٧٠٩ - الخلال ئەڵێت عبدالملک المیموني پێی ڕاگەیاندم : لەلای أبا عبدالله (ئیمام أحمد) باسی بشر المریسي کرا و وترا : (کافرە)، جا نەمبینی أبا عبدالله ئینکاری بکات لە قسەکەی .

١٧١٤ - عمر بن عثمان الواسطي برازای علي بن عاصم وتی : لە دوکان بووم یزید بن هارون بەلامدا تێپەڕی، پێم وت : ئەی باوکی خالد پێم گەیشتووە یەکێک لە بەغداد پێی ئەوترێت المریسي ئەڵێت قورئان مخلوق ە .

وتی : (هەرکەسێک بڵێت قورئان مخلوق ە کافرە) .

١٧١٧ - وکیع بن الجراح وتی : (المریسي کافرە) .

١٧١٨ - قتیبة بن سعید وتی : (بشر المریسي ی کافر) .

١٧١٩ - یزید بن هارون وتی : (لێرە کەسێکی لێ نییە المریسي بکوژێت ؟).

١٧٢٠ - أبو بکر الخلاد وتی گوێم لە وکیع بوو لە مینا بە المریسي ی وت : (ئەگەر پرسیارم لێ بکەن دەربارەی فەرمانیان پێ ئەکەم تۆبەی پێ بکەن، ئەگەر تۆبەی نەکرد خوێنی بڕێژن، یان بیکوژن، یان لە خاچی بدەن) .

١٧٢٢ - یزید بن هارون وتی : (الجواربي و المریسي هەردووکیان کافرن) .

: الجواربي موشەبیهە بووە .

١٧٣٥/ أ - يزيد بن هارون وتی : (بشر المريسي و أبوبكر الأصم هەردووكيان كافرن خوێنیان حەڵاڵە) .

١٧٣٦ - يزيد بن هارون وتی : (بشر المريسي كافره به الله) .

١٧٣٩ - الحسن بن موسى الأشيب ئەڵێت : (بشر المريسي و شعوانة ی النصرانی وەكو یەكن، هیچ جیاوازیەكیان نییە تەنها ئەوە نەبێت - المريسي - نوێژ ئەكات) .

١٧٤١ - هارون الرشيد وتی : (پێم گەیشتووە بشر المريسي ئەڵێت قورئان مخلوق ـە، سوێند بە الله ئەگەر دەستم پێی بگات بە كوشتنێک ئەیكوژم تا ئێستا هیچ كەسێكم وا نەكوشتبێت) .

١٧٤٢ - عباد بن عوام وتی : (قسەم كرد لەگەڵ المريسي و هاوەڵانی، بۆم دەركەوت كۆتایی قسەكەیان ئەوەیە ئەڵێن ئاسمان هیچی لێ نییە) .

كتاب السنة لـ الخلال

: واتە نەفی ئەوە ئەكەن الله عز وجل لەسەر عەرش بێت بە ذاتی خۆی .

لە سەردەمی سەلەفدا جەهمیەكان نەیانئەوێرا بە ئاشكرا نەفیكردنی علو بكەن، بەڵام دواتر غولاتی جەهمیەكان كە ئەشعەریەكانن بە ئاشكرا وتیان كە الله عز وجل بە ذاتی خۆی لەسەر عەرش نییە و بگرە ئەو كەسەشیان تەكفیر كرد كە ئیثباتی علو ئەكات .

لێرەدا تەنها باسی یەک نمونەی ناو سەدان نمونە ئەكەین :

إبن حجر العسقلاني لە شەرحە پڕ كوفریەكەی بۆ سەحیحی بوخاری بەرگی ١ لاپەڕە ٥٠٨ لەبارەی فەرموودەیەكەوە بە ئاشكرا نەفی علو ئەكات و ئەڵێت : ئەمە ڕەددی تێدایە بۆ ئەوانەی كە وا گومان ئەبەن الله بە ذاتی خۆی لەسەر عەرشە!

ئێستا بۆ دەرکەوت حوکمی سەلەف چی بووە لەسەر بشر المريسي، ئێستا تەماشا بکە بزانە إبن تيمية چی ئەڵێت دەربارەی الغززالي !

- إبن تيمية لە (مجموع الفتاوى) ئەڵێت : (ئەم تەئویلاتانەی ئەمڕۆ کە بەدەست خەڵکیەوەیە وەکو زۆربەی ئەو تەئویلاتانەی أبو بكر بن فورک (٤٠٦ هـ) لە کتێبی (التأويلات) باسی کردووە، وە أبو عبدالله محمد بن عمر الرازي لەو کتێبەی ناوی ناوە (تأسيس التقديس) باسی کردووە، وە لە غەیری قسەی ئەمانیشیدا هەیە وەکو أبي علي الجبائي و عبدالجبار بن أحمد الهمداني و أبي الحسين البصري و أبي حامد الغززالي و بێجگە لەوان ڕێک عەینی ئەو تەئویلاتانەیە کە بشر المريسي باسی کردووە) .

## باب : (٥)

## ئەوەی بڵێت الله عز وجل قسە ناكات ئەوە بت ئەپەرستێت



(جەهمیەکان بەهۆی جێبەجێکردنی یاسا کوفریە کەلامیەکانیان لەسەر الله تعالی کە سەرچاوەی گرتووە لە فەلسەفەی یۆنان، زۆرێک لە سیفەتەکانی الله تعالی یان ڕەتکردەوە، یەکێکی تر لەو سیفەتانە بریتیە لە (قسەکردن)، لەلای سەلەف رحمهم الله، الله تعالی قسە ئەکات هەرکاتێک بیەوێت بە چۆنیەتیەک کە ئێمە نازانین، وە بێگومان قسەکردنەکەی وەکو قسەکردنی دروستکراوەکانی نییە .

بەڵام لەلای جەهمیەکان الله تعالی قسە ناکات، هەرکاتێک بیەوێت قسە بکات ئەوە یان قسەکە دروست ئەکات، یان دروستکراوێک دروست ئەکات تا لەڕێیەوە ئەو قسەیانە بڵێت کە ئەیەوێت، بەم شێوەیە ئەو سیفەتی قسەکردنەیان پەکخست کە لە قورئان و فەرموودەدا هاتووە .

جەهمیەکان بە تەواوی گروپەکانیانەوە (جەهمیەکانی سەرەتا و کوللابیەکان و ئەشعەریەکان و ماتوریدیەکان) لەم کوفرە قێزەونەدا بەشدارن وە تەنها ئەمەیان بەسە بۆ کافربوونیان) .

جا ئەمە ڕێچکە و ڕێبازی جەهمیە کافرەکانە لە سیفەتەکانی الله تعالی دا، هەربۆیە زۆر لە یەهوودی و نەصرانیەکان کافرترن، وە کوفرەکەیان زۆر گەورەترە وەک چۆن لە ئەثەری ژمارە (١٠١) دا ئاماژەی پێدراوە .



٩٩ - هارون بن معروف وتی : (هەر کەسێک وا گومان ببات الله عز وجل قسە ناکات ئەوەی بت ئەپەرستێت ) .

: ئەم قسەیە مانای چییە : (ئەوەی بڵێت قورئان مخلوق ە، ئەوە بت ئەپەرستێت)؟

٦١ - هارون بن معروف رحمە الله ئەڵێت : (ئەوەی بڵێت قورئان مخلوق ە، ئەوە بت ئەپەرستێت) .

السنة لـ عبدالله

- خوێنەری ئەم ئەثەرەی تر بە :

١٨٣٧ - أحمد بن الحسن الترمذي ئەڵێت پرسیارم لە أحمد کرد وتم : ئەی أبا عبدالله، لە بابەتی قورئان ئەوە ڕوویدا کە ڕوویدا، جا ئەگەر پرسیاریان لێ کردم دەربارەی من چی بڵێم ؟

پێی وتم : (تۆ مخلوق نیت ؟)

وتم : بەڵێ .

وتی : (ئایا هەموو شتێکی تۆ مخلوق نییە ؟)

وتم : بەڵێ .

وتی : (قسەکەت - کەلامەکەت - لەخۆت نییە و مخلوق نییە ؟)

وتم : بەڵێ وایە .

وتی : (ئایا کەلامی الله عز وجل لە الله نییە ؟) وتم : بەڵێ .

وتی : (ئایا شتێکی الله هەیە مخلوق بێت ؟) .

ڕوونکردنەوە : بزانە رحمک الله شتەکان دوو جۆرن، یان مخلوق ـن، یان غیر مخلوق، ئەوەی کە مخلوق ـە هەموو شتێکی لە هەموو کاتێکدا و بە هەموو شێوازێک مخلوق ـە، بۆ نمونە تۆ، چاوت مخلوق ـە، ڕۆحت مخلوق ـە، قسەکەت مخلوق ـە، کردەوەکانت لە هەموو کاتێکدا مخلوق ـن، هەموو شتێکت لە هەموو کاتێک مخلوق ـە، هەرگیز نەبووە نییە و نابێت تۆ شتێکت ببێت بە غیر مخلوق لەبەر ئەوەی تۆ لە ئەسڵدا مخلوق ـیت .

وە الله تعالی خالق ـە، مخلوق نییە، هەموو شتێکی الله لە ذات و سیفات و ناو و أفعال ـەکانی غیر مخلوق ـن، هیچ کاتێک و بە هیچ جۆرێک هیچ شتێکی الله عز وجل نەبووە و نابێت بە مخلوق، هەر لەبەر ئەوەشە سەلەف فەرموویانە مادەم قورئان کەلامی الله ـیە ئەوە غیر مخلوق ـە .

- خوێنەری ئەم ئەثەرانەی تریش بە :

١٨٣٢ - أبا عبدالله (ئیمام أحمد) ئەڵێت : (ئەوەی بڵێت قورئان مخلوق ـە، ئەوە وتوویەتی الله مخلوق ـە) .

١٨٣٣ - أبا عبدالله (ئیمام أحمد) ئەڵێت : (الله لە ناوەکانیەتی، ئەوەی بڵێت مخلوق ـە، ئەوە وتوویەتی الله تبارک و تعالی مخلوق ـە) .

السنة للخلال

بەم سێ ئەثەرە مانای ئەثەری یەکەم ڕوون ئەبێتەوە، الله تعالى خالق ـە و هیچ کەسێک الله تعالى ی دروست نەکردووە و هیچ شتێکی مخلوق نییە، جا ئەگەر کەسێک بڵێت ناوی الله یان کەلامی الله مخلوق ـە، ئەوە الله ی هێناوەتە ئاستی مخلوق ـەکان چونکە وتوویەتی سیفەتێک یان شتێکی الله مخلوق ـە، بەم شێوەیە کاتێک جەهمیەک خوایەک ئەپەرستێت کە پێ وایە کەلامەکەی مخلوق ـە ئەوە بت ئەپەرستێت، چونکە شتێک ئەپەرستێت کە مخلوق ـە نەک الله تعالى کە هیچ شتێکی مخلوق نییە .

- عثمان بن سعید الدارمي ئەڵێت (٢٨٠ هـ) ئەڵێت : (کاتێک قەومەکەی موسی گوێرەکەکەیان پەرست الله پێی فەرموون : | أَفَلَا يَرَوْنَ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا : ئایا نابینن ئەو گوێرەکەیەی ئەیپەرستن وەڵامیان ناداتەوە و هیچ سوود و زیانێکی ئەوانی بەدەست نییە ؟ | (طه : ٨٩)

وە | عِجْلًا جَسَدًا لَّهُ خُوَارٌ أَلَمْ يَرَوْا أَنَّهُ لَا يُكَلِّمُهُمْ وَلَا يَهْدِيهِمْ سَبِيلًا اتَّخَذُوهُ وَكَانُوا ظَالِمِينَ : گوێرەکەیەک کە ئەیبۆڕاند، ئایا نەیانبینی کە قسەیان لەگەڵ ناکات و ڕێنماییان ناکات بۆ ڕێگەی ڕاست ؟ سەرەڕای ئەوەش پەرستیان و زاڵم بوون | (الأعراف : ١٤٨)

الدارمي ئەڵێت : (لەوەی کە باسمان کرد کەلامی الله مان چەسپاند بە نەص بەبێ تەئویل کردن، لەوەدا کە الله تعالى گوێرەکەکەی عەیبدار کردووە بەوەی کە ناتوانێت قسە بکات بەڵگەیەکی ڕوون هەیە لەسەر ئەوەی کە الله تعالى ئەتوانێت قسە بکات و قسەکەرە، لەبەر ئەوەی ڕەخنە ناگرێت لە گوێرەکەکە بە شتێک کە لە خۆیدا هەبێت) .

وە إبراهیم علیه السلام وتی : | قَالَ بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَاسْأَلُوهُمْ إِن كَانُوا يَنطِقُونَ : بتە گەورەکەیان ئەوانەی دیکەی شکاند، ئەوەتانێ لێیان بپرسن ئەگەر ئەتوانن قسە بکەن | (الأنبیاء : ٦٧) إبراهیم ڕەخنەی لە بت و پەرستراوە بەتاڵەکانی ئەوان نەگرت بەوەی کە ناتوانن قسە بکە ئیللا پەروەردگاری خۆی - واتە الله عز وجل - قسە ئەکات و قسەکەرە) .

### الرد على الجهمية

- إبن خزیمة (٣١١ هـ) ئەڵێت : (لەو ئایەتەی کە پێشتر خوێندمانەوە زانیمان کە الله جل وعلا ڕوو - وجه - ی هەیە، وە لە قورئاندا هەواڵمان پێدراوە کە ئەبیستێت و ئەبینێت،

جا الله جل وعلا به موسى و هارون ی برای صلوات الله عليهما ی فەرموو : | إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَىٰ : من لەگەڵتان ئەبيستم و ئەبينم | (طه : ٤٦) .

خۆشەويستی الرحمن صلوات الله وسلامه عليه به باوكی فەرموو : | لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِي عَنكَ شَيْئًا : بۆچی شتێک ئەپەرستيت كه نابيستێت و نابينێت و هيچ سوودێكی بۆت نييه! | (مريم : ٤٢) .

ئەی باشه ئايا مەحاڵ نييه خۆشەويستی الرحمن به ئازەری باوكی بڵێت : | لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ : بۆچی شتێک ئەپەرستيت كه نابيستێت و نابينێت | وه عەيبداری بكات بەوەی كه شتێک ئەپەرستێت نابيستێت و نابينێت، كەچی لەملاوه بانگی بكات بۆ پەرستنی شتێک كه نه ئەبيستێت و نه ئەبينێت وەكو بتەكان كه له مردووەكانن نەک له زيندووەكان ؟!

وه چۆن پەروەردگاری دروستكەری بەدينهێنەری بيسەری بينەری ئێمه بەو شێوەيەيه كه ئەو جاهيله پەكخەرانه وەسفی ئەكەن! الله جل وعلا گەورەتره لەوەی كه بيسەر و بينەر نەبێت، ئەوان وەكو ئەوانەن بتانێک ئەپەرستن كه نابيستن و نابينن، يان وەكو ئەوانەن كه ئاژەڵ ئەپەرستن، ئايا ئەم وتەيەی دروستكەر و بەديهێنەری ئێمەيان نەبيستووه : | أَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا (٤٣) أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا (٤٤) | (الفرقان ) الله عز وجل فێری كردين ئەوەی نابيستێت و نابينێت و ژيری ناخاتەكار وەكو مەڕوماڵاته و بگره لەوانيش گومڕاتره) .

## كتاب التوحيد وإثبات صفات الرب عز وجل

١٠٠ - محمد بن مصعب العابد وتی : (هەركەسێک وا گومان بيات كه تۆ - واته الله تعالى - قسه ناكەيت ، وه نابينرێيت له ئاخيرەتدا ، ئەوه كافره به ڕووی

تۆ، ناتناسێت، شایەتی ئەدەم کە تۆ لەسەرو عەرشیت، لە سەرو حەوت ئاسمان، بەو شێوەیە نا کە زەندیقەکانی دوژمنی الله ئەیڵێن).

١٠١ - **عبدالله بن المبارک** وتی : (ئێمە ئەتوانین وتەی یەهودی و نەسرانیەکان بگێڕینەوە بەڵام ناتوانن وتەی جەهمیەکان بگێڕینەوە .

پەروەردگارمان عز وجل وا ئەناسین کە لەسەر عەرشە لە سەروو حەوت ئاسمانەوە، وە جیایە لە دروستکراوەکانی بە سنوورێک).

١٠٢ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (دوو بەهەشت هەن و قاپ و قاچاغەکانی و ئەوەشی کە لەناو ئەو دوو بەهەشتە دایە ئاڵتونن، وە دوو بەهەشت هەن قاپ و قاچاغەکانی و ئەوەشی کە لەناو ئەو دوو بەهەشتەدایە زیون، لە نێوان ئەو خەڵکە و نێوانی سەیرکردنیان بۆ پەروەردگاریان عز وجل هیچ شتێك نییە ئیللا پۆشاکی خۆبەگەورەزانی نەبێت لەسەر ڕووخساری - الله تعالی -، لە بەهەشتی عەدن دا).

١٠٣ - **شهر بن حوشب** وتی : (وتم بە أم سلمة : ئەی دایکی ئیمانداران، زۆرترین دوعای رسول الله ﷺ چی بووە کاتێك لە لای تۆ بووە ؟

فەمووی : زۆرترین دوعای ﷺ : (يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ).

پێم وت : ئەی رسول الله بۆ ئەمە زۆرترین دوعاتە : (يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ)؟

فەرمووی ﷺ : (ئەی أم سلمة، هیچ ئادەمیەك نییە ئیللا دڵی لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی الله دایە، ئەگەر ویستی لێیبێت ڕاگیراوی ئەکات، وە ئەگەر ویستیشی لێیبێت لای ئەدات).

## باب : (٦)

## ئەوەی لە باوکم رحمە الله و شێخەکانەوە رحمهم الله پاراستوومە و نووسیومە دەربارەی ئەبو حەنیفە



ئەم بابە بۆ گومڕاکان قورسترین بابی ناو کتێبەکەیە، بەجۆرێک لەسەریان قورسە حەز ئەکەن چاویان وەکو دڵیان کوێر ببێت و ئەم بابە نەبینن .

ئەبو حەنیفە النعمان بن ثابت (٨٠ - ١٥٠) یەکێکە لەو کەسەی کە لەلای سەلەف رحمهم اللّٰه بە گومڕا و بیدعەچی دانراوە، وە لەلای گومڕا و بیدعەچیەکانیش ئیمامی ئەهلی سوننە و جەماعەیە، چەندین زانای سەلەف لەکاتی ژیانی خۆی و پاش مردنی قسەیان لەسەر کردووە و گومڕایەتیەکانیان دەرخستووە بۆ خەڵکی، هۆکاری سەرەکی ئەم تانەلێدان و بەگومرادانانەش ئەگەڕێتەوە بۆ هەبوونی چەندین گومڕایی لەم کەسە داماوەدا :

١ - هەبوونی عەقیدەی مەخلوقێتی قورئان و دووجار تۆبەپێکردنی بە ئامادەبوونی زانایان .

٢ - هەبوونی عەقیدەی ئیرجاء و بانگخوازی کردن بۆی و دەمەدەمێ کردن لەسەری .

٣ - هەبوونی عەقیدەی دەرچوون لەسەر وەلی ئەمری موسوڵمانان و بانگخوازی کردن بۆی .

٤ - ڕەتکردنەوەی سوننەتەکان و فەرموودەی رسول الله ﷺ و شوێنکەوتنی ڕەئی و هەوا و ئارەزووی خۆی .

٥ - بەکارهێنانی فێڵکردن لە فتواداندا، ئەوەی لەلای خەڵکی جاهیل بە حیلە شەرعی بەناوبانگە .

٦ - بەرپەرچدانەوە و ڕووبەڕووبوونەوەی فەرموودەکانی رسول الله ﷺ بە شێوازێکی زۆر ناشرین .

٧ - زەعیف بوون لە فەرمووددەدا و هەڵەکردنی زۆر تیایدا .

بۆ هەریەکێکیان بەڵگە دانراوە .

وەکو ئاشکرایە هەموو گومڕا و بیدعەچیەک دڵی زۆر توونـد ئەبێت بەرامبەر ئەم بەشەی کتێبەکە و زۆر لە خۆی ئەکات تا بە هەر جۆرێک بووە تانە لە سەنەد و مەتنەکانی وتەکان بدات، بەڵام هەمووجارێک بە دەستی بەتاڵ و سەرشۆڕی و زەلیلی و ڕسواییەوە ئەگەڕێتەوە، ئێمەش بۆ زیاتر ئێشپێگەیاندنیان خوێ زیاترمان کردووە بە برینەکەیاندا و لە پاش ئەثەرەکانی کتێبەکە وتەی ئیمامەکانی

سەلەف و چەند کەسێکی خەلەف و سەردەمیمان داناوە، الله تعالى بیکات بە مایەی هیدایەت بۆ ئەو کەسانەی کە شایەنی هیدایەتن .

شایەنی باسە ئەمانتوانی دوو وە سێ ئەوەندەی تر وتە بهێنین بەڵام لەبەر درێژنەبوونەوەی باسەکە ئەوەندە سەروزیادە بۆ کەسێک کە ئەیەوێت بەڕاستی شوێنکەوتەی سەلەف بێت رحمهم الله تعالى ) .



١٠٤ - إسحاق بن منصور الكوسج وتی : وتم بە أحمد بن حنبل : ئایا پیاو خێری دەست ئەکەوێت لە ڕقلێبوونەوە لە ئەبو حەنیفە و هاوەڵانی ؟

وتی : (ئەرێ واللە) .

١٠٥ - مهنا بن يحيي الشامي ئەڵێت : گوێم لە أحمد بن حنبل رضي الله عنه بوو وتی : (قسەی ئەبو حەنیفە و پشقل - قشپل - لەلام وەکو یەک وان) .

١٠٦ - محمد بن سعيد بن سلم لە باوکیەوە ئەڵێت : لە جرجان پرسیارم لە أبا یوسف - قوتابی نزیکی ئەبو حەنیفە -کرد دەربارەی ئەبو حەنیفە ؟

وتی : بۆچیتە چیی لێ ئەکەیت ؟ بە جەهمیەتی مرد .

١٠٧ - سعيد بن سلم وتی : وتم بە أبو یوسف : ئایا ئەبو حەنیفە هەمان قسەی جەهم ی ئەکرد ؟

وتی : (بەڵێ) .

١٠٨ - أبو يوسف ئەڵێت : (یەكەم كەس وتی قورئان مخلوق ە ئەبو حەنیفە بوو - واتە لە كوفە - ) .

١٠٩ - الحسن بن موسى الأشيب وتی : گوێبیستی أبو یوسف بووم وتی : ئەبو حەنیفە شمشێری ئەبینی - واتە لەسەر موسوڵمانان - .

وتم : ئەی تۆ ؟

وتی : بەنا بە الله .

١١٠ - حازم الطفاوي وتی : (ئەبو حەنیفە كاری بە كتێبەكان جەهم ئەكرد ، لە خۆراسان ەوە بۆی ئەهات) .

١١١ - سفيان الثوري ئەڵێت : حماد بن أبي سليمان - ماموستا مورجیئەكەی ئەبو حەنیفە - پێی وتم : (برۆ بۆلای ئەو كافرە - واتە ئەبو حەنیفە - پێی بڵێ ئەگەر ئەڵێیت قورئان مخلوق ە نزیكمان مەبەرەوە) .

١١٢ - محمد بن جابر ئەڵێت : (گوێم لە حماد بن أبي سليمان بوو جوێنی ئەدا بە ئەبو حەنیفە) .

١١٣ - **سفيان الثوري** وتی : گوێم لە حماد بوو ئەیوت : (سەرت نەسووڕماوە لە ئەبی حەنیفە! ئەڵێت قورئان مخلوق ە، پێی بڵێ : ئەی كافر ئەی زندیق) .

١١٤ - **يزيد بن يوسف الحميري** لە الأوزاعي ەوە كە بە توندترین عەیبداركردن ئەبو حەنیفە ی عەیبدار ئەكرد .

١١٥ - **محمد بن كثير المصيصي** وتی : الأوزاعي باسی ئەبو حەنیفەی كرد و وتی : (گرێكانی ئیسلامی گرێ بە گرێ هەڵئەوەشاندەوە) .

١١٦ - **الأوزاعي** وتی : (ئەبو حەنیفە بنیچینەكانی **- واتە قورئان وسوننەت -** لەدەست دا و ڕووی كردە قیاسكردن) .

١١٧ - **أبو إسحاق الفزاري** وتی : الأوزاعي و سفيان الثوري ئەیانوت : (هیچ لەدایكبوویەک لە ئیسلامدا لەدایک نەبووە شومتر بێت بۆ ئیسلام لە ئەبو حەنیفە) .

١١٨ - **أيوب السختياني** وتی : (ئەبو حەنیفە وای لەم دینە كرد تەنكتر بێت لە پۆشاكی سابري **- قوماشێكی زۆر تەنكە -** ) .

١١٩ - **عبدالله بن عون** وتی : (هیچ لەدایكبوویەک لە ئیسلامدا لەدایک نەبووە شومتر بێت بۆ ئیسلام لە ئەبو حەنیفە) .

١٤٠ - **معروف** وتی : الأعمش نەخۆش بوو ئەبو حەنیفە هاتە ماڵەوە بۆ سەردانیکردنی، ئەبو حەنیفە وتی : ئەی باوی محمد ئەگەر هاتنی منت لەسەر قورس نەبووایە هەموو ڕۆژێک ئەهاتم بۆ لات .

الأعمش وتی : (ئەوە کێیە ؟) .

وتیان : ئەبو حەنیفە .

وتی : (ئەی النعمان، سوێند بە الله قورسی **- لەسەرم -** لە ماڵەکەی خۆتدا، چجای ئەوەی بێیت بۆ لام!) .

١٤١ - **عثمان البتي** وتی : (وەیل بۆ ئەبو حەنیفە، خۆ جارێک هەڵە ناکات و دواتر ڕاستی بکاتەوە **- واتە لەسەر هەڵەکەی خۆی بەردەوام ئەبێت لەکاتێکدا ئەشزانێت کە هەڵەیە -**) .

١٤٢ - عبدالله بن الإمام أحمد ئەڵێت : باوکم بۆی گێڕامەوە وتی، شعیب بن حرب بۆی گێڕاینەوە وتی، گوێم لە **سفيان الثوري** بوو ئەیوت : (حەز ناکەم لە حەق یشدا موافقەیان بکەم) .

وتم بە باوکم رحمە الله : واتە ئەبو حەنیفە ؟

وتی : بەڵێ، پیاوێک دوو جار لە ئیسلامدا تۆبەی پێ کراوە - واتە ئەبو حەنیفە - .

وتم بە باوکم رحمە الله : ئایا تۆبە کراوە بە ئەبو حەنیفە ؟

وتی : بەڵێ .

١٤٣ - وە وتی : باوكم وتی : وا بزانم لەم ئایەتەدا تۆبەی پێكرا | سُبۡحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ | (الصَّافَّات : ١٨٠) .

ئەبو حەنیفە وتی : ئەمە مخلوق ە .

پێیان وت : ئەمە كوفرە، جا تۆبەیان پێ كرد .

١٤٤ - سفيان الثوري وتی : (دووجار تۆبە بە ئەبو حەنیفە كراوە لە كوفر دا) .

١٤٥ - سفيان الثوري وتی : (چەند جارێک تۆبە بە ئەبو حەنیفە كراوە لە قسەی زەندیقەكاندا) .

١٤٦ - شعيب بن حرب ئەڵێت : (سفیان الثوري پێی وتم : برۆ بۆلای ئەوە - واتە ئەبو حەنیفە - پرسیاری لێ بكە دەربارەی عیددەی ئافرەتێكی خاوەن منداڵ كە مێردەكەی ئەمرێت ؟ چووم بۆ لای و پرسیارم لێ كرد .

وتی - واتە ئەبو حەنیفە - : عیددەی لەسەر نییە .

گەڕامەوە بۆلای سفیان و هەواڵم پێدا، وتی : (ئەوە فتوای یەهوودیە) .

---

: الشعبي رحمه الله لە السنة ی خلال لێی ڕیوایەت كراوە ئەڵێت : (یەهوودیەكان پێیان وایە ئافرەت عیددەی نییە) .

١٢٧ - عبدالله بن الزبير الحميدي وتى : حمزة بن حارث بن عمير كە لە خێزانى عمر كوڕى خطاب ـ رضي الله عنه گێڕایەوە لە باوكیەوە كە وتى : گوێبیستى پیاوێك بووم پرسیارى لە ئەبو حەنیفە كرد لە مزگەوتى الحرام دەربارەى پیاوێك كە ئەڵێت : شایەتى ئەدەم كە كەعبە حەقە، بەڵام نازانم ئەمەیە یان نا ؟

جا ئەبو حەنیفە وتى : (ئیماندارى حەقیقیە) .

وە پرسیارى لێكرد دەربارەى پیاوێك كە ئەڵێت : شایەتى دەدەم كە محمد بن عبد الله پێغەمبەرە، بەڵام نازانم ئەوەیە كە قەبرەكەى لە مەدینەیە یان نا ؟

ئەبو حەنیفە وتى : (ئیماندارى حەقیقیە) .

الحمیدي وتى : (هەر كەس ئەمە بڵێت، ئەوە كافر بووە) .

١٢٨ - سفیان الثوري وتى : (هیچ منداڵێک لە کوفەدا -یان لەم ئوممەتەدا - لەدایک نەبووە زیانى زیاتر بێت لە ئەبو حەنیفە) .

١٢٩ - أبو عبدالرحمن عبدالله بن الإمام أحمد وتى : سلمة بن شبیب بۆى گێڕامەوە وتى، عبدالحمید الحماني بۆى گێڕاینەوە وتى : (پێم وابێت سفیان الثوري ـم بینى سەرى داپۆشیبوو ئەهات لە مەجلیسەكانى ئەبو حەنیفەدا دائەنیشت .

سلمة وتى : باسى ئەمەم كرد بۆ الفریابي وتى گوێم لە سفیان بوو وتى : هەرگیز پرسیارى هیچ شتێكم لە ئەبو حەنیفە نەكردووە، ئەو منى ئەبینى و پرسیارى لێ ئەكردم .

أبو عبدالرحمن - واته كوڕەكەی ئیمام أحمد - وتی : عبدالحمید الحماني أبو یحیی مورجیئە بوو، وە ئیرجائەكەی توند بوو، وە بانگەوازكار بوو، وە شێخ - واته ئیمام ئەحمد - زەمی ئەكرد ) .

١٣٠ - سفیان الثوري وتی : (هیچ كەسێك هێندەی ئەبو حەنیفە شتی لە ئیسلامدا دانەناوە، مەگەر أبو الخطايا نەبێت .

---

: أبو الخطايا كابرایەك بوو لەسەر زەندیقیەت لە خاچ درا .

١٣١ - سفیان الثوري وتی : (الله عز وجل گۆڕی ئەبو حەنیفە بكات بە ڕاخەرێك لە ئاگر ) .

١٣٢ - أبو نعیم الفضل بن دكین وتی : (لە مسجد الحرام لەگەڵ سفیان دانیشتبووین ، ئەبو حەنیفە بەرەوڕووی هات ، كاتێك سفیان بینی وتی : هەستن با تووشی گەڕیەتیمان نەكات ، ئێمە هەستاین و سفیان یش هەستا ) .

---

: ئەم ڕووداوە لە كۆتا ساڵەكانی ژیانی ئەبو حەنیفەدا ڕوویداوە، چونكە ئەبو حەنیفە ساڵی ١٥٠ ھ مردووە، وە أبو نعیم الفضل بن دكین ساڵی ١٣٠ ھ لەدایك بووە، وە تەبەلەی سفیان الثوري بووە، ئەگەر ئەوكاتە تەمەنی أبو نعیم تەنها ١٥ ساڵیش بوو بێت ئەوە ساڵی ١٤٥ ھ تەنها ٥ ساڵ بەر لە مردنی ئەبو حەنیفە ڕوویداوە .

١٣٣ - منصور بن أبي مزاحم وتی : (گوێم له مالک بن أنس بوو باسی ئەبو حەنیفه ی کرد، جا خراپەی باسی کرد، وتی : (دینی تێکدا)، وه وتی : (ئەوه دین تێکبدا دینی نییه) .

١٣٤ - منصور بن أبي مزاحم جارێکی وتی : (گوێم له مالک بوو به قسەیەک باسی ئەبو حەنیفه ی کرد که دەری ئەکرد له دین، وه وتی : (ئەبو حەنیفه هیچی تێک نەدا تەنها دین نەبێت)) .

١٣٥ - أبا علي العذري وتی : (وترا به حماد بن زید : ئەبو حەنیفه مرد.

وتی : (سوپاس بۆ الله که ناخی زەوی پێ پڕ کرد) .

١٣٦ - إسحاق بن عيسى الطباع وتی : (پرسیارم کرد له حماد بن زید دەربارەی ئەبو حەنیفه .

وتی : (ناسراوه به دەمەدەمێ و مشتومڕ له ئیرجاء دا) .

١٣٧ - شريک القاضي وتی : (ئەگەر له هەموو کۆلانێک له کۆلانەکانی کوفەدا مەیفرۆشێک هەبێت باشتره لەوەی کەسێکی تێدا بێت قسەی ئەبو حەنیفه بلێتەوه) .

١٣٨ - **أبو نعيم الفضل بن دكين** وتی : (شريک ئەبو حەنيفە و هاوەڵانی زۆر لەلا خراپ بوو، وە ئەیوت : (مەزهەبەکەیان بریتیە لە ڕەتکردنەوەی فەرمووده لە رسول الله ـەوە ﷺ)) .

١٣٩ - **حفص بن غیاث** وتی : (لەلای ئەبو حەنیفە دائەنیشتم، جا گوێم لێبوو لە ڕۆژێکدا پێنج فتوای جیاوازی ئەدا لەبارەی بابەتێک، کە ئەمەم بینی وازم لێ هێنا و ڕووم کردە فەرمووده) .

١٤٠ - **يوسف بن أسباط** وتی : (ئەبو حەنیفە وتی : ئەگەر رسول الله ﷺ بە من بگەیشتبایە ئەوە کاری بە زۆربەی قسەکانی من ئەکرد) .

١٤١ - **أبو عوانة** ئەڵێت : (پرسیار کرا لە ئەبو حەنیفە دەربارەی خواردنەوەکان، هەر پرسیارێکی لێ بکرایە ئەیوت : کێشەی نییە .

وە پرسیاری لێکرا دەربارەی سەرخۆشکەر ؟

وتی : حەڵاڵە) .

١٤٢ - **أبو إسحاق الفزاري** وتی : فەرموودەیەکم بۆ ئەبو حەنیفە گێڕایەوە لە رسول الله ـەوە ﷺ دەربارەی ڕەددانەوەی شمشێر **- واتە دەرچوون لەسەر وەلی ئەمری موسوڵمان -** .

وتی : ئەو فەرموودەیە خورافەیە) .

**١٤٣** - کاتێک ئەبو حەنیفە مرد **الأوزاعي** وتی : (سوپاس بۆ ئەو الله یەی کە مراندی، چونکە گرێکانی ئیسلامی گرێ بە گرێ هەڵئەوەشاندەوە).

**١٤٤** - **الأوزاعي** وتی : (ئێمە ڕەخنە لە أبو حنيفة ناگرین لەسەر ئەوەی ڕاو و بۆچوونی هەبووە هەمووومان ڕاو و بۆچوونمان هەیە، بەڵام ئێمە ڕەخنەی ئەوەی لێدەگرین کە فەرموودەی لە رسول الله ﷺ ەوە بۆ باس دەکرا، فتوای دەدا بە پێچەوانەیەوە).

**١٤٥** - **شريك بن عبدالله** وتی : (بینیم ئەبو حەنیفە یان ئەگێڕا بە حەلقەکانی مزگەوتدا تۆبەی پێ ئەکرا).

**١٤٦** - **أبو جعفر بن سليمان** وتی : (سوێند بە الله ئەبو حەنیفە جەهمی بوو، هەمان بۆچوونی بشر بن موسى ی هەبوو، وە بشر هەمان بۆچوونی خەواریجەکانی هەبوو).

**١٤٧** - **الأوزاعي** وتی : (دوو جار تۆبە کرا بە ئەبو حەنیفە لە کوفردا).

**١٤٨** - بە **شريك** وترا : (لە چ شتێکدا تۆبەتان بە ئەبو حەنیفە کرد ؟

وتی لە کوفردا).

١٤٩ - **سفيان** و **شريک بن عبدالله** و **حسن بن صالح** وتيان : (گەيشتين بە ئەبو حەنيفە و بە هيچ شتێک لە فيقهـ دا ناسراو نەبوو، تەنها بە دەمە دەمێ و موناقەشەكردن ناسراو بوو) .

١٥٠ - **الأصمعي** وتى : (سوێند بە الله ئەبو حەنيفە دووجار لە كوفردا تۆبەی پێ كرا) .

١٥١ - **مؤمل بن إسماعيل** وتى : (گوێم لە حماد بن سلمة بوو باسی ئەبو حەنيفەی كرد وتى : (ئەبا حەنيفە پێشوازی لە ئاثار و سوننەتەكان كرد بە ڕەتكردنەوەيان بە ڕاو و بۆچوونی خۆی)) .

١٥٢ - محمد بن عبدالعزيز بن أبي رزمة وتى : گوێم لە باوكم بوو وتى : لەلای **حماد بن سلمة** بووين باسی بابەتێكيان كرد وترا : ئەبو حەنيفە وا ئەڵێت .

حماد وتى : (سوێند بە الله ئەوە قسەی ئەو المارق ەيە) .

١٥٣ - الوليد بن صالح ئەڵێت : گوێم لە **حماد بن سلمة** بوو كاتێک باسی ئەبو حەنيفە بكرايە ئەيوت : (ئەوە أبو جيفة يە) .

---

: (أبو جيفة) واتە كەلاكە تۆپيو .

١٥٤ - الهيثم بن جميل وتی : گوێم لە **حماد بن سلمة** بوو دەربارەی ئەبو حەنیفە ئەیوت : (اللە ئەمە بەسەردا ئەخاتە ناو ئاگرەوە) .

١٥٥ - منصور بن سلمة الخزاعي وتی : گوێبیستی **حماد بن سلمة** بووم لەعنەتی کە ئەبو حەنیفە ئەکرد، وە **شعبة** لەعنەتی لە ئەبو حەنیفە ئەکرد .

١٥٦ - سفیان بن عبدالملک وتی : گوێبیستی **عبدالله بن المبارک** بووم دەربارەی قسەیەکی ئەبو حەنیفە وتی : (دزیکردن و ڕێگری هەندێک جار لەمە باشترە) .

١٥٧ - أبو صالح یود بن هانئ وتی : وترا بە **إبن المبارک** : ڕیوایەتت کرد لە ئەبو حەنیفە ـەوە ؟

وتی : (پێی تاقیکرامەوە - **واتە پەشیمانم** - ) .

١٥٨ - **سفیان بن عیینة** وتی : (هیچ کەسێکم نەبینیوە بەجورئەت تر بێت بەرامبەر اللە لە ئەبو حەنیفە، پیاوێکی خۆراسانی هات بۆ لای وتی : سەد هەزار پرسیارم پێیە بۆت، ئەمەوێت دەربارەیان پرسیارت لێ بکەم .

ئەبو حەنیفە وتی : بیانڵێ .

سفیان وتی : ئایا لەمە بەجورئەتترتان بینیوە بەرامبەر اللە ؟) .

١٥٩ - سفيان بن عيينة وتی : (ڕۆژێکیان لەلای ئەبو حەنیفە بووم، پیاوێک هات بۆ لای پرسیاری لێکرد دەربارەی بابەتێکی الصرف، جا هەڵەی تێدا کرد .

وتم : ئەی ئەبو حەنیفە ئەمە هەڵەیە، ئیتر تووڕە بوو، وە بەو پیاوەی وت کە فتوای بۆ دا : بڕۆ کاری پێ بکە، هەر تاوانێکیشی تێدا بوو لەسەر ملی من) .

١٦٠ - سفيان بن عيينة وتی : (هیچ لەدایکبوویەک لە ئیسلامدا لەدایک نەبووە شومتر بێت بۆ ئیسلام لە ئەبو حەنیفە) .

١٦١ - سفيان بن عيينة وتی : (ئەبو حەنیفە نموونەی بۆ فەرموودەی رسول الله ﷺ ئەهێنایەوە تا ڕەتی بکاتەوە، پێی گەیشتبوو کە من فەرموودەیەک ڕیوایەت ئەکەم لە رسول الله ـەوە ﷺ کە ئەفەرمووێت : (کڕیار و فرۆشیار ئەتوانن بڕیار بدەن هەتا لەیەک جیا نەبنەوە) .

ئەبو حەنیفە وتی : ئەی ئەگەر لەناو کەشتیەکدا بوون، چۆن جیا ئەبنەوە ؟!

سفيان وتی : (ئایا گوێبیستی لەمە خراپتر بوون ؟) .

١٦٢ - أبو إسحاق الفزاري وتی : (ئەبو حەنیفە مورجیئە بوو، شمشێری بە ڕەوا ئەبینی) .

١٦٣ - أبو إسحاق الفزاري وتی : (فەرمووده‌یه‌کی رسول الله ﷺ لە دژی بەرەوابینینی شمشێردا بۆ ئەبو حەنیفە گێڕایەوە، وتی ئەو فەرموودەیە خورافەیە ! ) .

١٦٤ - أبو إسحاق الفزاري وتی : (ئەبو حەنیفە ئەیوت : ئیمانی ئیبلیس و ئیمانی ئەبو بەکر رضي الله عنه وەکو یەکە، ئەبو بەکر وتی : ئەی پەروەدگارم، ئیبلیس وتی : ئەی پەروەدگارم) .

١٦٥ - عبدالله بن إدریس وتی : وتم بە مالک بن أنس : ئێمە علقمة و الأسود مان هەبوو .

وتی : (ئێوە یەکێکتان لابوو بار و دۆخەکەی ئاوا هەڵگێڕایەوە . وە پشتی دەستی هەڵگێڕایەوە بۆ لەپی دەستی - واتە ئەبو حەنیفە - ) .

١٦٦ - حفص بن غیاث وتی : لەلای ئەبو حەنیفە دانیشتم، لە بابەتێکدا دە فتوای دا، نازانین کامەی وەربگرین .

١٦٧ - أسود بن سالم ئەڵێت : لەگەڵ أبو بکر بن العیاش بووم لە مزگەوتی بني أسید، پیاوێک پرسیاری لێکرد دەربارەی شتێک، پیاوێکی تر وتی : ئەبو حەنیفە ئاوا و ئاوا ئەڵێت .

أبو بکر بن عیاش وتی : (الله ڕووی ئەبو حەنیفە ڕەش بکات، وە ڕووی ئەوەی کە ئەو قسەیە ئەکات) .

١٦٨ - **وكيع بن الجراح** وتی : كاتێک ئەبو حەنیفە قسەی لە ئیرجائدا کردوو و دەمە دەمە و موناقەشەی تێدا کرد سفیان الثوري وتی : ئەبێت ئەمە لە کوفە دەربەدەر بکرێت .

١٦٩ - **حماد بن سلمة** وتی : (ئەم ئەبو حەنیفە یە، سوێند بە الله ئاواتەخوازم الله عز وجل بیخاتە جەهەننەمەوە ) .

١٧٠ - **أبو عبدالرحمن المقري** وتی : (سوێند بە الله ئەبو حەنیفە مورجیئە بوو، وە بانگی کردم بۆ ئیرجاء بەڵام من قبووڵم نەکرد لێی ) .

١٧١ - **مالک بن أنس** وتی : (الداء العضال ) واتە بەهیلاکچوون لە دیندا، ئەبو حەنیفە الداء العضال ـە ) .

١٧٢ - **أسود بن سالم** وتی : (هەر کە ئەثەر هات ڕەئی ئەبو حەنیفە و هاوەڵانیمان فڕێدایە زبڵدانەوە .

دەست بگرە بە ئەثەر و پێوەی پابەند بە، گەیشتم بە ئەهلی عیلم ڕقیان لە ڕەئی ئەبو حەنیفە بوو و عەیبداریان ئەکرد ) .

١٧٣ - **محمد بن جابر** وتی : (گوێم لە ئەبو حەنیفە بوو وتی : عمر بن الخطاب هەڵەی کرد .

منیش مشتێک بەردم هەڵگرت و دام لە دەموچاوی ) .

١٧٤ - سلمة بن سليمان وتی : پیاوێک پرسیاری کرد لە عبدالله بن المبارک دەربارەی شتێک، ئەویش فەرموودەیەکی پێغەمبەری ﷺ بۆ گێڕایەوە .

پیاوەکە وتی : ئەبو حەنیفە بە پێچەوانەی ئەوەوە فتوای داوە .

عبدالله بن مبارک زۆر تووڕە بوو، وتی : (لە رسول الله وە ﷺ بۆ ئەگێڕمەوە کەچی تۆش باسی ڕەئی کەسێکم بۆ ئەکەیت کە فەرموودە ڕەتئەکاتەوە ؟! لەمڕۆ بەدواوە فەرموودەتان بۆ ناگێڕمەوە و هەستا ) .

١٧٥ - هارون بن سفيان وتی پرسیارم لە أسود بن سالم کرد دەربارەی أبي زائدة ؟

وتی : (حافظ بوو، بەڵام باسی ئەبو حەنیفەی ئەکرد و بە فتواکانی ئەو فتوای ئەدا، لەبەر ئەوە لەلای من ضعيف ە ) .

واتە بەهۆی باسکردنی ئەبو حەنیفە یان گێڕانەوەی فەرموودە لێی

١٧٦ - بە عبدالرزاق وترا : ئەبو حەنیفە مورجیئە بوو ؟

وتی : (بەڵێ بەڕاستی ) .

١٧٧ - يوسف بن أسباط وتی : (ئەبو حەنیفە لەسەر فیترەت لەدایک نەبووە، ئەبو حەنیفە چوارسەد فەرموودەی لە رسول الله ەوە ﷺ ڕەتکردەوە).

١٧٨ - ئەبو حەنیفە وتی : (ئەگەر پێغەمبەر ﷺ پێم بگەیشتایە ئەوە زۆری لە من و لە وتەکانم وەرئەگرت، بۆ مەگەر دین هەر ڕەئی نییە ؟) .

١٧٩ - **محمد بن جابر** وتی : (گوێم لە ئەبو حەنیفە بوو پیاوێک باسی وتەیەکی بۆ کرد لە عمر بن الخطاب ـەوە رضي الله عنه، جا - **ئەبو حەنیفە** - وتی : عمر بن الخطاب هەڵەی کردووە) .

منیش مشتێک بەردم هەڵگرت و هەڵمدا بەرەوڕووی .

١٨٠ - **علي بن عاصم** وتی : (فەرموودەیەکم بۆ ئەبو حەنیفە گێڕایەوە لە بابەتی هاوسەرگیری یان تەڵاقدان، وتی : ئەمە بڕیاردانی شەیتانە) .

١٨١ - **يحيى بن معين** وتی : (ئەبو حەنیفە مورجیئە بوو، وە لە بانگخوازان بوو - بۆ ئیرجاء - ، وە لە فەرموودەدا هیچ نەبوو) .

١٨٢ - **سعيد** وتی : (لەلای ئەبو حەنیفە دانیشتم لە مەککە و باسی شتێکی کرد، پیاوێک پێی وت : لە عمر بن الخطاب ـەوە ئەوە و ئەوە گێڕدراوەتەوە .

وتی : ئەوە وتەی شەیتانە) .

١٨٣ - **أبو الأحوص** وتی : (ڕۆژێک پیاوێک پرسیاری لە هشیم کرد، ئەویش فەرموودەیەکی بۆ گێڕایەوە، پیاوەکە وتی : ئەبو حەنیفە و محمد بن الحسن و هاوەڵانی پێچەوانەی ئەمە ئەڵێن .

هشيم وتی : ئەی بەندەی الله بەڕاستی زانست لە كەسی نزم و كەم وەرناگیرێت ) .

١٨٤ - **أبو عمر الشيباني** وتی : (كاتێک إسماعيل بن حماد بن أبي حنيفة كرا بە قازی چووم بۆلای هەتا ڕۆشتمە ژوورەوە ، وتم : پێم گەیشتووە كە تۆ ئەڵێیت قورئان كەلامی الله یە، وە مخلوق ـە .

وتی : ئەمە دینی خۆم و باو و باپیرانمە ) .

١٨٥ - **هوذة بن خليفة** وتی : (بینیم ئەبو حەنیفە ڕیشی گیرابوو وەكو بزن ئەگێڕدرا بەسەر دانیشتنەكاندا و لە كوفر تۆبەی پێ ئەكرا) .

١٨٦ - **عبدالله بن يزيد** وتی : (ئەبو حەنیفە بانگی كردم بۆ ئیرجاء) .

---

**هەندێک وتەی تر دەربارەی :**

**١ - علي بن عاصم وتی : بە أبو حنيفة م وت : إبراهيم لە علقمة ـەوە ڕیوایەت دەكات ئەویش لە عبدالله ـەوە ڕیوایەت دەكات كە پێغەمبەر ﷺ پێنج ركعات نوێژی پێكردن، پاشان دوو سووجدەی برد دوای سەلامدانەوە.**

**أبو حنيفة وتی : گەر لە ركعەتی چوارەم دانەنیشتبێت ئەوا ئەم نوێژە یەكسانە بەمە، ئاماژەی بۆ شتێک كرد لەسەر زەوی بوو جا هەڵیگرتەوە و فڕێی دا.**

**المجروحين : ٤٠٧/٢**

**: ئەم فەرموودەیەی لەم ڕیوایەتەدا باسكراوە لە صحيح ی موسليم ـدا هاتووە .**

ڕیوایەتەکەش بێئەدەبی و جورئەتی أبو حنیفة پیشان دەدات بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ کە فەتوای ئەوە دەدات نوێژەکەی پێغەمبەر ﷺ هیچ نرخێکی نییە و بەتاڵە.

٢ - البرذعي ئەڵێت : أبو زرعة لە کتێبەکەی مندا فەرموودەیەکی بینی کە لە أبو حاتم ڕیوایەتم کردبوو ئەویش لە شێخێکی خۆیەوە، ئەویش لە أیوب بن سوید ئەویش لە أبو حنیفة تا دەگاتە پێغەمبەر ﷺ، أبو حاتم یش لە تەنیشت أبو زرعة دانیشتبوو.

أبو زرعة پێی وتم : گلەیی لە کێ دەکرێت لەم کارەدا (واتا : ڕیوایەتکردنی فەرموودەی أبو حنیفة) تۆ یان أبو حاتم ؟

وتم : من

وتی : بۆ ؟

وتم : چونکە من ناچارم کرد بیخوێنێتەوە ئەو ڕازی نەبوو ئیللا دوای هەوڵێکی زۆر، جا أبو زرعة وتەیەکی زۆر توندی پێ وتم کە بیرمچووەتەوە لە کتێبەکەمدا لەو کاتەدا.

منیش پێم وت : إبراهیم بن أورمة گرنگی بە سەنەدەکانی أبو حنیفة دەدات.

أبو زرعة وتی : إنا لله وإنا إلیه راجعون، موصیبەتەکەمان گەورەبوو دەربارەی إبراهیم، گرنگی پێ دەدات! لەبەر چی باوەڕ بە أبو حنیفة دەکات ؟ لەبەر شوێنکەوتنی بۆ سوننەت ؟ لەبەر توانای بەهێزی لەبەرکردنی ؟

پاشان وتەیەکی زۆر توندی وت دەربارەی إبراهیم لێرەد باسم نەکردووە.

پاشان وتی : ڕەحمەتی الله لە أحمد بن حنبل بێت، پێم گەیشت کە دڵی تەنگ بووبوو بۆ ژمارەیەک فەرموودە دەرکەوتبوون لەلای المعلي بن منصور، ئەویش پێویستی پێیان بوو، المعلی لەناو ئەهلی ڕەئی لە هەموویان زیاتر کە زانا دەچوو، چونکە ئەو بەدوای عیلم دەگەڕا و گەشتی دەکرد بۆی و گرنگی پێدەدا، جا أحمەد ئارامی گرت لەسەر ئەم فەرموودانە و یەک پیتیشی لە المعلی نەبیست، بەڵام علي بن المدیني و إبن خثیمة و زۆرینەی هاوەڵەکانمان

فەرموودەکانیان لێی بیست، جا چ شتێکی المعلى بە هی أبو حنيفة دەچێت؟ المعلى صدوق ـە، أبو حنيفة سەنەدە پچڕاوەکانی دەکرد بە متصل.

پاشان أبو زرعة وتی : أبو حنيفة ڕیوایەتی کردووە لە موسى بن أبي عائشة عن عبدالله بن شداد عن جابر عن النبي ﷺ لە سەنەدی فەرموودەکەدا جابر ی زیاد کرد، واتا فەرموودەی قورئان خوێندن لە دوای ئیمام، وە أبو حنيفة دەیوت قورئان مەخلوقە، وە فەرموودەکانی پێغەمبەری ﷺ ڕەت دەکردەوە، وە گاڵتەی بە ئاثارەکان دەکرد، وە بانگەوازی دەکرد بۆ بیدعە و گومڕاییەکان، دوای هەموو ئەمانە گرنگی بە ڕیوایەتەکانی دەدرێ! کەس کاری ئاوا ناکات تەنها گێلێکی جاهیل نەبێت، یان وتەیەکی لەم شێوەیەی وت،

ئینجا أبو زرعة تووڕەیی خۆی بەسەر إبراهيم دا ڕشت، وە ئەو فەرموودانەی أبو حنيفة ی باسکرد کە هیچ ئەصڵێکی نییە . . . . . پاشان پێی وتم (واتا أبو زرعة دەڵێت) : ئەوەی وتی قورئان مەخلوقە ئەوا کافرە، جا گرنگی بە سەنەدی کافران دەدرێ؟

سؤالات البرذعي لأبي زرعة : ٩٥٦

: ئەم وتەیە لە هەموو ڕیوایەتەکان بەنرخترە، چونکە سەدان ڕیوایەتیش بهێنین کە أبو حنيفة وتویەتی قورئان مەخلوقە و گاڵتەی بە فەرموودە کردووە و ڕەتی کردووەتەوە ئەوا کەسانێک هەر دەڵێن زەعیفە جا بە هەر بیانویەک بێت، بەڵام کاتێک زانایەکی گەورەی وەکو أبو زرعة ئیثباتی ئەوە دەکات کە أبو حنيفة ئەم شتانەی تێدا هەبووە واتا صەحیحن، چونکە أبو زرعة ئیمامە لە زانستی فەرموودەدا مەحاڵە کۆمەڵێک ڕیوایەتی زەعیفی پێبگات نەزانێت زەعیفن و بەپێی ئەم ڕیوایەتە زەعیفانە حوکم بدات لەسەر أبو حنيفة، أبو زرعة لەو ئاستەدا نییە لە شتێک دڵنیا نەبێت بە گومانەوە بیداتە پاڵ أبو حنيفة، پێتان وایە أبو زرعة بەهۆی ڕیوایەتی زەعیف ـەوە ئەم قەناعەتەی بۆ دروست بووبێت دەربارەی أبو حنيفة؟

وتەکەش تەکفیرکردنێکی ڕوونی أبو حنيفة ـیە لەلایەن أبو زرعة. هەروەها ڕەتکردنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ و گاڵتەکردن بە ئاثار و بانگەوازی کردن بۆ بیدعە و گومڕایی هەمووی دایە پاڵ أبو حنيفة، ئەمە لەکاتێکدا مشتومڕ هەیە لەسەر ئەوەی

ئایا تەوبەی كردووە لە وتنی قورئان مەخلوقە یان نا، كەچی أبو زرعة هەر سوورە لەسەر تەكفیركردنی چونكە ڕەتكردنەوەی فەرموودە و گاڵتەكردن بە ئاثار هەر كوفرە، كاتی ئەوە نەهاتووە عەقڵتان بێننەوە بەرخۆتان و بڵێن ئەمانە دەستیان گرتووە بە وتەی سەلەف ـەوە و هیچ شتێكیان لە خۆیانەوە دروست نەكردووە؟! گەر لە تەكفیركردنیش هاوڕایان نەبین دەبێت سووربین لەسەر ئەوەی كە أبو حنیفة كەسێكی گومڕا و بیدعەچی بووە شایەنی ئەوەیە ڕقمان لێی بێت و بە بچووك سەیری بكەین نەك بیكەین بە پێشەوای ئەهلی سوننە دوای ئەوەی ئەم هەموو وتانەی لەسەر چەسپاوە؟

٣ - سفیان بن عیینة وتی: (فەرموودەیەكم بۆ أبو حنیفة گێڕایەوە لە رسول الله ﷺ، أبو حنیفة وتی میز ی بەسەردا بكە).

المجروحين: ٢ / ٤١٠

٤ - علي بن عاصم دەڵێت: (فەرموودەیەكم بۆ أبو حنیفة گێڕایەوە لە رسول الله ﷺ، أبو حنیفة وتی: وەری ناگرم،

وتم: رسول الله ﷺ!

وتی: وەری ناگرم.

تأريخ بغداد: ١٥ / ٥٣٣

٥ - یحیی بن آدم وتی: ئەو فەرموودەیە بۆ أبو حنیفة باسكرا كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (دەستنوێژ نیوەی ئیمانە).

أبو حنیفة وتی: با دوو جار دەستنوێژ بگرین تا ئیمانمان كامڵ بێت!

إسحاق - بن راهويه - وتی: یحیی بن آدم وتی: دەستنوێژ نیوەی ئیمانە واتا نیوەی نوێژە، چونكە الله تعالی نوێژی بە ئیمان ناوبردووە ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ ج﴾، إيمانكم واتە: صلاتكم.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (نوێژ قبووڵ نییە تەنها بە دەستنوێژەوە نەبێت) جا دەستنوێژ نیوەی ئیمانە بەو مانایەی کە باسمانکرد کە نوێژ تەواو نابێت تەنها بە دەستنوێژ نەبێت.

أبو عبدالله دەڵێت : إسحاق وتی : يحيى بن آدم وتی : ئەم وتەیە بۆ أبو حنيفة باسکرا کە دەڵێت : (نازانم نیوەی عیلمە)، أبو حنيفة وتی : با دووجار بڵێ نازانم تا عیلمەکەی کامڵ بێت! يحيى وتی : مانای ئەم وتەیە کە دەڵێت : (نازانم نیوەی عیلمە) لەبەر ئەوەیە کە عیلم لە دەزانم و نازانم پێکهاتووە، جا هەریەکێکیان نیوەی ئەوەی ترە.

تأريخ بغداد : ١٥ / ٥٣٤

: لەم ڕیوایەتەوە فێری دوو شت ئەبین :

بێئەدەبی ئەبو حەنیفە بەرامبەر فەرموودەکانی رسول الله ﷺ و گاڵتەپێکردنیان.

ئەبێت تێگەیشتنی سەلەف وەربگرین بۆ فەرموودەکانی رسول الله ﷺ.

٦ - يوسف بن إسباط وتی :

أبو حنيفة چوارسەد فەرموودەی پێغەمبەری الله ی ﷺ ڕەتکردەوە یان زیاتر.

پێم وت : ئەی باوکی محمد ئەو فەرموودانە دەزانی کامانەن ؟

وتی : بەڵێ.

وتم : هەندێکیانم پێ بڵێ.

وتی : پێغەمبەری الله ﷺ فەرموویەتی : (للفرس سهمان وللرجل سهم) - واتە : لە غەنیمەتدا ئەسپەکە دوو بەشی بەردەکەوێت و کەسەکەش یەک بەش -.

أبو حنيفة وتی : من بەشی ئاژەڵ لە بەشی ئیماندار زیاتر دانانێم.

وە پێغەمبەری الله ﷺ حوشتر و مانگاکانیان بریندار کرد لەکاتی حەجدا بۆ جیاکردنەوەی و ناسینەوەی.

أبو حنيفة وتی : ئەمە هەتک کردنە.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (البيعان بالخيار ما لم يتفرقا) - واتە : کڕیار و فرۆشیار بۆیان هەیە پەشیمان ببنەوە پێش جیابوونەوەیان لە یەکتر لە شوێنی کڕین و فرۆشتنەکە -.

أبو حنيفة وتی : گەر فرۆشتنەکە ئەنجامدرا پەشیمانبوونەوە نییە.

وە پێغەمبەری الله ﷺ تیروپشکی ئەکرد لەنێوان خێزانەکانی گەر بیویستایە دەربچێت بۆ سەفەر.

أبو حنيفة وتی : تیروپشک قومارە.

وە أبو حنيفة وتی : گەر پێغەمبەر ﷺ پێم گەشتبایە یان پێی گەیشتبام ئەوا زۆربەی وتەکانی منی وەردەگرت و کاری پێدەکرد، بۆ دین مەگەر لە ڕەئی چاک چیی ترە ؟

تأريخ بغداد : (١٥ / ٥٣٦)

٧ - إبن قتيبة دەربارەی دەرکەوتنی فیتنەی لەفز بە قورئان دەڵێت : گەر خەڵکی عاقڵ بێدەنگ بن لەم باسە ئەوا جاهیلەکان بێدەنگ نابن، گەر زمانەکان بگیرێن ئەوا دڵەکان ناگیرێن، وە ئەو کەسانەی کە دەستیان دایە ئەم باسە پێشەنگیان هەبوو لە زانایانی پێش خۆیان کاتێک جەهم و أبو حنيفة قسەیان کرد دەربارەی قورئان، پێش ئەم کاتە لەنێوان خەڵکیدا ئەم باسە نەبوو، وە نەزانرابوو.

الإختلاف في اللفظ والرد على الجهمية والمشبهة : ٦٠

: تەماشا بکە إبن قتيبة أبو حنيفة ی لە ڕیزی جەهمی کوڕی سەفواندا داناوە!

٨ - سعيد بن سلم الباهلي وتى : بيستم إسماعيل بن حماد بن أبي حنيفة لە ماڵى المأمون دەيوت : قورئان مەخلوقە، ئەمە دينى منە و دينى باوكمە و دينى باپيرمە.

الكامل في ضعفاء الرجال : ٢ / ١٢٥

٩ - المعلمي دەڵێت : (وتنى قورئان مەخلوقە زۆر بەربڵاو بووە لە أبو حنيفة ـەوە، إسماعيل ی نەوەی أبو حنيفة لە فيتنەی خەلقى قورئاندا هاوارى دەكرد و دەيوت : ئەمە دينى باب و باپيرمە) .

التنكيل : (١ / ٥٢٦)

١٠ - القاسم بن حبيب وتى : (نەعلەكەم لەناو وردەبەرد دانا، پاشان بە أبو حنيفة ـم وت : گەر كەسێک نوێژ بكات بۆ ئەم نەعلە تا دەمرێت بەڵام لە دڵيەوە الله بناسێت، چى دەڵێيت دەربارەی ؟

أبو حنيفة وتى : ئيماندارە.

منيش وتم : تا هەتايە قسەت لەگەڵ ناكەم) .

تأريخ بغداد : ١٥ / ٥١٠

١١ - عبدة وتى : بيستم باسى ئەبو حەنيفە كرا، پياوێک لە إبن المبارک ی پرسى : ئەبو حەنيفە هيچ بيدعەيەكى تێدا بوو ؟

ابن المبارک وتى : بەڵێ، ئيرجاء.

المعرفة والتأريخ : ٢ / ٧٨٣

١٢ - عبدالمليک بن حبيب دەڵێت : مطرف پێى ڕاگەياندم كە پرسياريان كردووە لە مالک بن أنس لە شەرحى (الداء العضال : لەناو چوون لە ديندا)، ئەويش وتوويەتى : ئەمە ئەبو حەنيفە و هاوەڵەكانيەتى، ئەو خەڵكى گومڕاكرد بە دوو ڕێگا، بە ئيرجاء، وە

هەڵوەشاندنەوەی فەرموودەکان، بۆیە ئەو لەلامان شوومترین کەسە لەدایک بووە لە ئیسلامدا، خەڵکێکی زۆر پێی گومڕا بوون، وە ئەوان بەردەوامن لە درێژە پێدان بە گومڕایی تاکو ڕۆژی قیامەت.

**تفسير غريب الموطأ : (٢ / ١٦٠ - ١٦١)**

**١٣** - إبن حبان دەربارەی ئەبو حەنیفە دەڵێت : (جائیز نییە احتجاجی پێ بکرێت، چونکە ئەو بانگەوازی دەکرد بۆ ئیرجاء، وە بانگەوازیکەر بۆ بیدعە جائیز نییە احتجاجی پێ بکرێت لەلایەن پێشەوا گەورەکانمان. نازانم لە نێوانیاندا خیلاف هەبێت کە پێشەوایانی موسوڵمان و ئەهلی وەرع لە دیندا لە هەموو شارەکان و ناوچەکانی تردا جەرحیان کردووە و لەکەداریان کردووە یەک بەدوای یەکتر) .

**المجروحين : ٢ / ٤٠٦**

: ئەوەی یەک تۆز شارەزای عیلمی حەیدث هەبێت ئەزانێت إبن حبان چەندە شلە لە تەسحیح کردن، بەڵام ئەبو حەنیفە ئەوەندە گومڕایە تەنانەت إبن حبان یش ڕیوایەتی لێوە نەکردووە، چجای بگاتە ئیمامی بوخاری و موسلیم و مالک و شافعی و ئەبو داود و . . .

**١٤** - إبن المبارک وتی : (ئەوەی سەیری کتێبی (الحيل) ی ئەبو حەنیفە بکات حەرامی الله حەڵاڵ دەکات، وە حەڵاڵی الله حەرام دەکات) .

**تأريخ بغداد : ١٥ / ٥٥٥**

**١٥** - ابن المبارک وتی : (هەر کەسێک کتێبی (الحيل) لەماڵەکەیدا بێت فەتوای پێ بدات، یان کار بکات بەو شتانەی کە لە نێو کتێبەکەدا هەیە ئەوا ئەو کەسە کافرە، ژنەکەی لێی جیا دەبێتەوە و حەجی بەتاڵ دەبێتەوە.

أبو إسحاق دەڵێت : بە ابن المبارک وترا : لەم کتێبەدا هاتووە ئەگەر ژنێک بیەوێت جیاببێتەوە لە مێردەکەی ئەوا هەڵدەگەرێتەوە کە ئیسلام (مورتەد ئەبێتەوە) تا لێی جیا دەبێتەوە، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ ئیسلام.

جا ابن المبارک وتی : هەر کەسێک ئەم کتێبەی دابنێت کافرە، ژنەکەی لێی جیابووەتەوە و حەجەکەی بەتاڵ بووەتەوە.

خاقان المؤذن بە ابن المبارک ی وت : کەس ئەم کتێبەی دانەناوە جگە لە ئیبلیس، ابن المبارک وتی : ئەو کەسەی ئەم کتێبەی داناوە لەلای من لە ئیبلیس ئیبلیسترە).

تأريخ بغداد : ١٥ / ٥٥٦

: تەماشای کاردانەوەی ئیمامی ابن المبارک (١٨١ هـ) بکە بۆ کتێبی الحیل ی ئەبو حەنیفە

١٦ - إبن أبي يعلى الحنبلي لە ژیاننامەی عبدالخالق بن منصور دا دەڵێت : (لە ئیمامەکەمان چەند شتێکی گێڕاوەتەوە، لەوانە : بیستم أحمد بن حنبل دەیوت : هەر کەسێک کتێبی الحیل ی لەلا بێت لە ماڵەکەیدا فەتوای پێ بدات ئەوا کافرە بەو قورئانەی کە بەسەر محمد ﷺ دابەزیوە.

طبقات الحنابلة : ١ / ٢١٨

١٧ - الكرجي القصاب وتی : (فێڵی نەهی لێکراو ئەوەی کە لە ئەبو حەنیفە وە ژمێردراوە وەکو زەم ئەو جۆرەیە کە حەڕام حەڵاڵ دەکات و حەڵاڵ حەرام دەکات).

نكت القرآن : ١ / ٦٢٣

١٨ - المروذي وتی : بیستم بندار ئەیوت : گوێم لە عبدالرحمن بن مهدي بوو ئەیوت : (هیچ فیتنەیەک لە ئاسمانەوە دانەبەزیوە زیانبەخشتر بێت لە ئەبو حەنیفە) .

أخبار الشيوخ واخلاقهم : ٢٧٦

١٩ - حرب الكرماني وتی : (ئەهلی ڕەئی بیدعەچی و گومڕان، دوژمنانی سوننەت و ئەثەرن، دین بە ڕەئی و قیاس و إستحسان دەبینن، وە موخالەفەی ئاثار دەکەن و فەرموودە بەتاڵ ئەکەنەوە، وە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕەت دەکەنەوە، وە ئەبو حەنیفە و ئەوانەی لەسەر ڕەئی ئەون دەکەن بە پێشەوا و دینداری دەکەن بە دینی ئەوان و هەمان قسەی ئەوان دەکەن، جا چ گومڕاییەک لەمە ڕوونترە کە کەسێک ئاوا بڵێت یان لەسەر ئەم عەقیدەیە بێت، واز لە وتەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان بهێنێت و شوێنی وتەی ئەبو حەنیفە و هاوەڵانی بکەوێت، ئەمەندە بەس بۆ گومڕایی و طوغیان و ڕەتکردنەوە.

السنة لـ حرب الكرماني : ١٠٩

٢٠ - مقبل بن هادي الوادعي وتی : (برایەک لە براکانی شاری عەدەن پرسیاری لێ کردم لە ڕێگای تەلەفونەوە دەربارەی ئەبو حەنیفە کە ئایا لە ئەهلی سوننە و جەماعەتە یان نا؟ منیش بێدەنگ بووم، پاشان پێم وابوو کە واجبە ئەو شتە بڵێم کە باوەڕم پێیەتی و دینداری پێوە دەکەم، ئەبو حەنیفە لە ئەهلی سوننە و جەماعەت نییە) .

البشائر في السماع المباشر لعبدالله بن عياش الأدهل : ٦٢

٢١ - الشافعي ئەیوت : (محمد بن الحسن (یەکێک کە دوو نزیکترین تەلەبەی ئەبو حەنیفە) : کامیان زاناترن، هاوەڵەکەی ئێمە یاخود هاوەڵەکەی ئێوە؟ (واتە : ئەبو حەنیفە و ئیمامی مالک).

الشافعي دەڵێت وتم : بە ئینصافەوە؟

محمد وتی : بەڵێ.

وتم : سوێندت دەدەم بە الله کامیان زاناتر بوون بە قورئان، هاوەڵەکەی ئێمە یان هاوەڵەکەی ئێوە؟

وتی : هاوەڵەکەی ئێوە (واتە : ئیمامی مالک).

وتم كاميان زاناترن بە سوننەت، هاوەڵەكەی ئێمە یان هاوەڵەكەی ئێوە ؟

وتی : هاوەڵەكەی ئێوە.

وتم : سوێندت دەدەم بە الله كامەیان زاناترن بە وتەی پێغەمبەر ﷺ و پێشینان، هاوەڵەكەی ئێمە یان هاوەڵەكەی ئێوە ؟

وتی : هاوەڵەكەی ئێوە

وتم : هیچ نەماوەتەوە تەنها قیاس نەبێت، قیاسیش ناكرێت تەنها لەسەر ئەم شتانە نەبێت، جا ئەوەی ئەصلەكەی نەزانی لەسەر چ شتێک قیاس دەكات ؟

آداب الشافعي و مناقبه : ١١٩

٤٢ - الشافعي وتی : (ئەبو حەنیفە یەكەم بابەت بە هەڵە دادەنێت و هەموو كتێبەكە لەسەر ئەو بابەتە قیاس دەكات) .

آداب الشافعي و مناقبه : ١٢٩

٤٣ - الشافعي وتی : (سەیری چەند كتێبێكی هاوەڵانی ئەبو حەنیفە م كرد، ١٣٠ پەڕ بوو، ٨٠ پەڕم تێیدا ژمارد كە پێچەوانەی قورئان و سوننەت بوو. إبن أبي حاتم دەڵێت : چونكە ئەصلەكە هەڵە بووە جا لە فەرعەكانیش لەسەر هەڵە ڕۆیشتوون) .

آداب الشافعي و مناقبه و تأريخ بغداد : ١٥ / ٥٦٦ - ٥٦٧

٤٤ - الشافعي وتی : (كەس ناناسم كتێبی نووسیبێت و كتێبەكانی ببن بە بەڵگە لەسەر عەیب و عاری وتەكانی وەک ئەبو حەنیفە.

آداب الشافعي و مناقبه : ١٣٠

٤٥ - الشافعي وتی : (بیستم بە مالک وترا : ئەبو حەنیفە دەناسیت ؟

وتی : بەڵێ، گومانتان چییە بەرامبەر پیاوێک گەر بڵێ ئەم دینگەکە لە زێڕ دروستکراوە ئەوا هەر لەسەری بەردەوام دەبێت تاکوو دەیکات بە زێڕ، کەچی لە دار یان بەرد دروستکراوە ؟

إبن أبي حاتم دەڵێت : واتە ئەبو حەنیفە لەسەر هەڵە دەمایەوە و بەڵگەی بۆ هەڵەکەی دەهێنایەوە، وە نەدەگەڕایەوە بۆ صەواب کاتێک بۆی دەردەکەوت.

آداب الشافعي و مناقبه : ١٦٢

٢٦ - إبن عمار وتی : (ئەگەر لە شتێکدا گومانت هەبوو، سەیری وتەی ئەبو حەنیفەت کرد و پێچەوانەی ئەوت کرد ئەوە حەقە، یان وتی : بەرەکەت لەوەدایە پێچەوانەی ئەو بکەیت).

تأريخ بغداد : ١٥ / ٥٦٢

٢٧ - مالک وتی : (بەردەوام کاروباری دین ڕێک بوو هەتاکو ئەبو حەنیفە دەرکەوت و دەستی دایە قیاس، جا نە سەرفراز بوو نە سەرکەوتوو).

جامع بيان العلم وفضله : ٢١٠٢

٢٨ - مالک وتی : (گەر ئەبو حەنیفە بە شمشێر خروجی کردبووایە لەسەر ئەم ئوممەتە، هێشتا سووکتر بوو لەو قیاس و ڕەئیەی کە دەریدەخست تێیاندا).

جامع بيان العلم وفضله : ٢١٠٣

٢٩ - پرسیارکرا لە أبو الحسن علي بن عمر الدارقطني منیش گوێم لێگرتبوو دەربارەی کتێبەکەی (مكرم بن أحمد) کۆکراوەی ڕیوایەتەکانی مەدحکردنی ئەبو حەنیفە.

الدارقطني وتی : هەڵبەستراوە هەمووی درۆیە، أحمد بن المغلس الحماني هەڵیبەستووە، خزمی جبارة

تأريخ بغداد : ٥ / ٣٤٢

٣٠ - أبو عوانة وتی : (من دەچوومە لای ئەبو حەنیفە تاكو شارەزا بووم لە وتەكانی، پاشان چووم بۆ حەج، كاتێک گەڕامەوە چوومە مەجلیسەكەی، هاوەڵانی پرسیاریان لێم دەكرد دەربارەی شتانێک منیش بە شێوەیەک وەڵام دەدایەوە كە ئەوان موخالفی من بوون، منیش وتم : ئەو شتانەی وتم لە ئەبو حەنیفە م بیستووە، دواتر پرسیارم لێی دەكرد دەربارەی، زانیم كە لە وتەكانی پاشگەزبووەتەوە .

وتی - واتە ئەبو حەنیفە - : بینیم ئەم وتەیە چاكترە لەوەی پێشوو، منیش وتم هەر دینێک ڕاگواستنی تێدابێت ئەوا پێویستیم پێی نییە، جلەكانم هەڵتەكاند و هیچی تر نەگەڕامەوە بۆ لای) .

تأريخ بغداد : ١٥ /٥٥٣

: لەبەر ئەوەی ئەبو حەنیفە حسابی بۆ فەرموودە نەئەكرد و بە ڕەئی خۆی فتوای ئەدا، ئیتر زوو زوو ڕەئی ئەگۆڕا، لەبەر ئەوەی شوێن ڕەئی خۆی كەوتووە نەک فەرموودە، تەماشاكە كاتێک دەڵێت (بینیم ئەم وتەیە چاكترە لەوەی پێشوو) .

٣١ - أبو داود خاوەنی السنن وتی : گوێم لە ئەحمەد بوو ئەیوت : سفيان بن عيينه ئەیوت : هاوەڵانی ڕەئی سێ دانەن، عثمان لە بەسرە، وە ربيعة لە مەدینە، وە ئەبو حەنیفە لە كوفە.

وە وتی : باسی بابەتێكم كرد بۆ (ئیمام) ئەحمەد لە پیاوێكەوە كە سەیری كتێبەكانی ئەهلی ڕەئی كردووە، وە ئەو پیاوە مەستوورە (واتە حاڵی دیار نییە، نازانرێت ئەهلی سوننەیە یان نا).

ئەحمەد وتی : بە دەگمەن هەیە كەسێک سەیری ڕەئی بكات و دڵی بۆگەن نەبێت.

مسائل أبي داود لإمام أحمد

: ئیمام ئەحمەد دەڵێت ئەوەی سەیری کتێبەکانی ئەهلی ڕەئی بکات ئیللا دڵی بۆگەن ئەبێت، ئەی ئەبو حەنیفە کە ئیمامی ئەهلی ڕەئیە دەبێت حاڵی چۆن بێت ؟!

**٣٢** - إبن حبان البستي کە زۆر شلە لە تەوثیق کردنی ڕاویەکاندا دەربارەی ئەبو حەنیفە ئەڵێت : (فەرموودە پیشەی ئەو نەبوو، **١٣٠** فەرموودەی گێڕایەوە، لە دنیادا لەوەندە فەرموودەیە زیاتری نەبوو، لە **١٢٠** فەرموودە هەڵەی کرد، یان سەنەدەکەی وەردەگێڕا یان مەتنەکەی ئەگۆڕی بە شێوەیەک هەر نازانرێت، جا کاتێک هەڵەی لە صەوابی زیاتر بوو شایستەی ئەوە بوو کە تەرک بکرێت لە احتجاج پێکردنی لە نەقڵ کردنی فەرموودەدا

وە لە لایەکی ترەوە نابێت بەڵگەی پێ بهێندرێتەوە لەبەر ئەوەی بانگەوازکار بووە بۆ ئیرجاء، وە بانگەوازکار بۆ بیدعە نابێت بەڵگەی پێ بهێنرێتەوە لەلای ئیمامەکانی ئێمە . . . هەتا ئەڵێت . . . وە جەرحیان کردووە و قسەیان پێ وتووە دانە بە دانەیان! . . . هەتا کۆتایی قسەکەی

**المجروحين : ٢ / ٤٠٦**

إبن حبان چەند شتێکی ڕوونکردەوە :

- داماو بووە لە فەرموودەدا.

- بانگەوازکار بووە بۆ ئیرجاء.

- زانایانی ئەهلی سوننە دانە بە دانە قسەیان پێ وتووە.

ئەگەر کەسێک داماو بێت لە فەرموودەدا ئەسڵەن بۆ فتوا ئەدات ؟ ئەی بە چی فتوا ئەدات ؟ بێگومان بە ڕەئی خۆی، هەر بۆیە ئەبو حەنیفە ئیمامی ئەهلی ڕەئی و گومڕاییە.

پاشان إبن حبان لە لاپەڕە **٤٠٦** ـەوە **٣٧** ڕیوایەت ئەهێنێت لە سەلەفەوە کە تێیدا باسی کوفر گومڕاییەکانی کراوە هەتا لاپەڕە **٤١٣** .

٣٢ - إبن عدي ده‌رباره‌ی ئه‌بو حه‌نیفه‌ ئه‌ڵێت : (له‌ أحاديث صالحة، زۆربه‌ی ئه‌وانه‌ی ڕیوایه‌تی ئه‌كات هه‌ڵه‌یه‌ و گۆڕانی پیت و زیادكردن له‌ سه‌نه‌د و مه‌تنه‌كه‌یدا هه‌یه‌، وه‌ هه‌روه‌ها هه‌ڵه‌كردن له‌ناوی ڕاویه‌ك، جا زۆربه‌ی ئه‌وانه‌ی ڕیوایه‌تی ئه‌كات ئاوایه‌، وه‌ له‌ هه‌موو ڕیوایه‌ته‌كانیدا هیچی سه‌حیح نییه‌ له‌ سه‌رووی ١٠ دانه‌ فه‌رمووده‌وه‌ نه‌بێت، له‌كاتێكدا له‌وانه‌یه‌ زیاتر له‌ ٣٠٠ فه‌رمووده‌ی ڕیوایه‌ت كردبێت له‌ فه‌رمووده‌ی ناسراو و نامۆ كه‌ هه‌مووی به‌م شێوه‌یه‌یه‌، چونكه‌ ئه‌و ئه‌هلی حه‌دیث نییه‌، وه‌ له‌و كه‌سانه‌ش ڕیوایه‌تی ناكات كه‌ ئه‌هلی حه‌دیث بن.

الكامل في ضعفاء الرجال : ١٠/ ١٣٣- ١٣٤

: إبن عدي چه‌ند شتێك ڕوون ئه‌كاته‌وه‌ :

- ئه‌بو حه‌نیفه‌ ئه‌هلی حه‌دیث (ئه‌هلی سوننه‌) نه‌بووه‌، وه‌ ئه‌گه‌ر فه‌رمووده‌یه‌كیشی ڕیوایه‌ كردبێت له‌ ئه‌هلی حه‌دیث (ئه‌هلی سوننه‌) ‌وه‌ ڕیوایه‌تی نه‌كردووه‌.

- ئه‌و فه‌رمووده‌یانه‌ی كه‌ گێڕاویه‌تیه‌وه‌ زۆربه‌ی هه‌ڵه‌یه‌، جا كه‌سێكی وه‌كو ئیمام احمد ملیۆنیك فه‌رمووده‌ی له‌به‌ر بێت و ئه‌بو حه‌نیفه‌ش چه‌ند فه‌رمووده‌یه‌كی سه‌حیحی گێڕابێته‌وه‌ ئه‌خرێنه‌ یه‌ك ئاست ؟! بێگومان نه‌خێر.

- ئه‌ڵێن مادەم فه‌رمووده‌ی ڕیوایه‌ت كردووه‌ كه‌واته‌ ئیمامه‌ و ئه‌هلی سوننه‌یه‌، به‌ڵام بێئاگان له‌وه‌ی كه‌ له‌ خه‌واریج و مورجیئه‌ و ڕافیضه‌كانیش كۆمه‌ڵه‌ كه‌سێك هه‌ن كه‌ ڕیوایه‌تی فه‌رمووده‌یان كردووه‌، ئایا ئه‌وانیش ئیمامن ؟!

- ئه‌ی باشه‌ فه‌رمووده‌ی نه‌زانیوه‌ به‌ چ شتێك فتوای داوه‌؟! ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌نده‌ فه‌رمووده‌ كه‌م ئه‌زانێت و فه‌رمووده‌كانیشی زۆربه‌ی هه‌ره‌ زۆری هه‌ڵه‌ن ئه‌سڵه‌ن بۆ فتوا ئه‌دات ؟ ئه‌ی ئه‌گه‌ر فتوا بدات به‌ چ شتێك ئه‌یدات ؟ بێگومان به‌ ڕه‌ئی خۆی، هه‌ر بۆیه‌ ئیمامی ئه‌هلی ڕه‌ئی و گومڕاییه‌ نه‌وه‌ك ئه‌هلی سوننه‌ و جه‌ماعه‌.

٣٤ - أبو زرعة الرازي وتى : (خەڵكى الري توشى فيتنه ببون بەهۆى أبوحنيفة-ەوە، ئێمەش گەنج بووين لەگەڵ ئەو خەڵكە دەڕۆيشتين، وە من خەريكى كۆكردنەوەى فەرموودەكانى أبو حنيفة بووم، پرسيارى ئەم كارەم لە أبو نعيم كرد، وە پێم وابوو كارێكى چاك دەكەم، الحميدي كتێبى (الرد على أبي حنيفة)ى دەخوێندەوە منيش خەريک بوو پەلامارى بدەم، تاكو الله منەتى بەسەردا كردين گومڕايى ئەوانمان زانى.

سؤالات البرذعي لأبي زرعة : ١٠٠٨

: هەر ئەو ئەبو زورعەيە كە لە سەرەتاى تەمەنى كاريگەر بووە بە ئەبو حەنيفە چونكە خەڵكى خوراسان بووە تاكو ئەم دەقەيەش خەڵكى خوراسان زۆربەيان حەنەفى مەزهەبن هەر لە سەردەمى هارون الرشيد تاكو ئەمڕۆ كاريگەرى مەزهەبى ئەبو حەنيفەيان لەسەر بووە، جا ئەبو زورعە خۆى ئەڵێ بە گەنجى ئێمە توشى فيتنە ببوين بەهۆى ئەبو حەنيفەوە، وە گرنگيم ئەدا بە كۆكردنەوەى ريوايەتەكانى ئەبو حەنيفە، بە جۆرێک كاريگەر بووە پێى تەنانەت خەريک بووە لە الحميدي بدات چونكە كتێبێكى داناوە بۆ ڕەددانەوەى ئەبو حەنيفە لە بەردەم ئەبو زورعە و خەڵكانى تر كتێبەكەى خوێندووەتەوە .

٣٥ - مسلم بن الحجاج ئەڵێت : (ڕوايەتى أبي سنان عن علقمة لە مەتنى ئەم فەرموودەيەدا كە ئەڵێت : (جبريل عليه السلام وتى هاتووم پرسيارى شەرائيعەكانى ئيسلامت لێ بكەم) ئەمە بڕگەيە زيادەيەكى دروستكراوە لە هيچ لەفزێكدا بوونى نييە، ئەم بڕگەيە كەسانێک زياديان كرد لە ڕيوايەتى ئەم فەرموودەيەدا وەكو النعمان بن ثابت - واتە ئەبو حەنيفە - و سعيد بن سنان و ئەوانەى ڕێگاى ئەمانەيان گرتووەتەبەر لە ئيرجاء، ويستيان ئەوەبوو لەم كارەدا وتەكەى خۆيان لە بابەتى ئيماندا بەڕاست دابنێن و عەقيدەى ئيرجائى لەسەر دابمەزرێنن، ئەم كارەش لە زياتر لاوازكردنى وتەكەيان هيچى تر نەبوو، وە زياتر لە حەق دووركەوتنەوە كە لە خۆيانەوە شتيان زياد كرد لە فەرموودەدا.

التمييز : ١٩٩ - ٢٠٠

: مورجيئەكان پێيان وايە كە عەمەل لە خودى ئيمان نييە بەڵكو شرائع ی ئيمانە، هەر بۆيە ئەبو حەنيفە وشەى شرائع ی لە فەرموودەكەى جبريل زياد كردووە هەتا بەهۆى

ئەم درۆیەوە نوێژ و زەکات و حەج و ڕۆژوو لە ئیمان بکاتە دەرەوە، وە ئەمە ڕەخنەیەکەی زۆر توندە لەلایەن ئیمام مسلم ـەوە کە تۆمەتباری ئەکات بە درۆکردن و گۆڕینی فەرموودە بۆ سەرخستنی عەقیدەی ئیرجاء، وە ئەمە گومانی ئەو کەسانە پووچەڵ ئەکاتەوە کە ئەڵێن ئەبو حەنیفە ئیرجائەکەی خەفی بووە! کابرا لەپێناو سەرخستنی ئیرجائدا درۆی بۆ جبریل علیه السلام هەڵبەستووە لەوە گومڕایی لەوە زیاتر چییە؟! وە هەروەها دەعوەی خەڵکیشی کردووە بۆ ئیرجاء.

**٣٦** - حماد بن زید وتی، گوێم لە أیوب - السختیاني التابعي - بوو باسی ئەبو حەنیفەی لەلا کرا وتی : | يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ |

ئەیانەوێت بە فووی دەمیان نووری الله بکوژێننەوە، وە الله نوور و دینەکەی خۆی ئەگەیەنێت و بڵاوی ئەکاتەوە با کافرانیش پێیان ناخۆش بێت.

**الضعفاء للعقيلي : (١٥٥/٦) ت: السرساوي**

**٣٧** - الفضل وتی : (هیچ فەقیهێک نەبووە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بە چاکە ناوی ڕۆشتبێت ئیللا ئەبو حەنیفە و مەجلیسەکەی عەیبدار کردووە) .

**الكامل في الضعفاء لإبن عدي : ١٦٤٦٥**

**٣٨** - نعیم بن حماد وتی : (کە ئەبو حەنیفە مرد لەلای سفیان - الثوري - بووم، وتی : الحمدلله، گرێکانی ئیسلامی گرێ بە گرێ ئەکردەوە، لە ئیسلامدا لە ئەو شوومتر - واتە ئەبو حەنیفە - لەدایک نەبووە.

**الكامل في الضعفاء لإبن عدي : ١٦٤٧٧**

**٣٩** - إبن أبي داود السجستاني وتی : (تانەدان لە ئەبو حەنیفە ئیجماعێکە (کۆڕا) لە سەلەفەوە، لەبەر ئەوەی ئیمامی بەسرە: أیوب السختیاني قسەی لەسەر کردووە، ئیمامی کوفە : (سفیان) الثوري قسەی لەسەر کردووە، ئیمامی مصر : لیث بن سعد قسەی لەسەر

کردووە، ئیمامی شام : الأوزاعي قسەی لەسەر کردووە، ئیمامی خۆراسان : عبدالله بن المبارک قسەی لەسەر کردووە، لەبەر ئەوە تانەدان لێی ئیجماعێکە (کۆڕا) لە سەلەفەوە لە هەموو لایەکەوە) .

الكامل في الضعفاء لإبن عدي : ١٦٤٩٠

٤٠ - إبن أبي داود السجستاني ڕۆژێک بە هاوەڵانی وت : (چی ئەڵێن دەربارەی بابەتێک کە مالک و هاوەڵانی و الشافعي و هاوەڵانی و الأوزاعي و هاوەڵانی و الحسن بن صالح و هاوەڵانی و سفیان الثوري و هاوەڵانی و أحمد بن حنبل و هاوەڵانی لەسەر کۆک بن ؟

پێیان وت : ئەی أبو بكر هیچ بابەتێک لەم بابەتە ڕاستر نییە.

وتی : هەموو ئەمانە کۆک بوون لەسەر بەگومڕاданانی أبو حنيفة).

تأريخ بغداد : ٥٢٧/١٥

٤١ - إبن الجارود ئەڵێت : (النعمان بن ثابت أبو حنيفة باس و خواسی بەربڵاو بوو، خیلاف هەبووە دەربارەی موسوڵمان بوونی) .

پاشان إبن عبدالبر ئەڵێت : جا ئەمە و شتی لەم جۆرە شاراوە نابێت لەو کەسەی کە بەباشی تەماشای ئەو شتانە بکات کە لەبارەیەوە - واتە ئەبو حەنیفە - هاتووە، لە مالک ـەوە رحمه الله ڕیوایەت کراوە نزیک لەوەی کە سفیان وتوویەتی کە - ئەبو حەنیفە - خراپترین کەسە کە لە ئیسلامدا لەدایکبووە وە ئەگەر بە شمشێر لەسەر ئوممەت دەربچوایە باشتر بوو، وە هەر لە ئەوەوە ڕیوایەت کراوە دەربارەی وتەکەی ئیمامی عمر (الداء العضال : لەناو چوون لە دیندا) لە عێراق وتوویەتی : ئەبو حەنیفە، ئەمانە هەمووی ئەهلی حەدیث لە مالک ڕیوایەتیان کردووە.

الإنتقاء (ص : ١٥٠)

٤٢ - المروذي وتی : (پرسیارم کرد لە باوکی عبدالله - ئیمام ئەحمەد - دەربارەی ئەبو حەنیفە و عمرو بن عبید، ئەحمەد وتی : ئەبو حەنیفە خراپترە بۆ موسوڵمانان لە عمرو بن عبید، چونکە ئەبو حەنیفە هاوەڵی هەیە) .

تأريخ بغداد : ٥٦٧/١٥

: عمرو عبید ئیمامی الکلام و ئیعتیزال و قەدەر ـە، وە لەلایەن سەلەف ـەوە تەکفیر کراوە، وە عمرو بەراورد بە نعمان هاوەڵی کەم بووە، بۆیە ئیمام ئەحمەد وا ئەڵێت.

٤٣ - محمد بن عبدالوهاب وتی : (بە علي بن عثام م وت : ئەبو حەنیفە حوججەیە ؟

وتی : نە بۆ دین، نە بۆ دنیا) .

تأريخ بغداد : ٥٦٤/١٥

٤٤ - أبو بكر الأثرم وتی : (چەندین جار بینیم أبو عبدالله - ئیمام احمد - ئەبو حەنیفە و مەزهەبەکەی عەیبدار ئەکرد، وە هەندێک لە وتەکانی ئەگێڕایەوە بۆ سەرزەنشتکردن و سەرسووڕمان.

تأريخ بغداد : ٥٦٨/١٥

٤٥ - محمد بن يوسف البيكندي وتی : (وترا بە أحمد بن حنبل : وتەی ئەبو حەنیفە (تەڵاقدان پێش نیکاح و زەواج)؟

أحمد وتی : ئەبو حەنیفەی داماو، ئەو لە عێراقیەکان نەبوو، لە عیلمدا هیچ نەبوو، - ئەو بابەتە - لەسەری هاتووە لە رسول الله ﷺ و هاوەڵان و بیست و پێنج تابیعی وەکو سعید بن جبیر و، سعید بن مسیب و، عطاء و، طاووس و عکرمة، چۆن ئەوێرێت بڵێت تەڵاق ئەدرێت ؟

تأريخ بغداد : ٤١١/١٣

: ئەبو حەنیفە وتوویەتی پێش نیكاح ئافرەت تەڵاق ئەدرێت، ئیمام ئەڵێت لە سەلەفەوە بەو شێوەیەی خۆی كە باسی كرد هاتووە، جا چۆن ئەوێرێت قسەی لەو شێوەیە بكات ؟

وە وتەی (ئەو لە عێراقیەكان نەبوو) واتە وەكو عێراقیەكان شارەزا نەبوو لە دیندا.

٤٦ - أبو بكر الأعين وتی : (گوێم لە أحمد بن حنبل بوو ئەیوت : لە هیچ كەسێكیانەوە مەنووسەرەوە و هیچ ڕێز و كەرامەتێكیان نییە، واتە هاوەڵانی أبو حنيفة) .

الكامل في الضعفاء : ١٦٥٨

٤٧ - وكيع بن الجراح دەڵێت : (أبو حەنیفە منی بینی، وتی: واز لە نوسینی فەرموودە بهێنە، خۆت فێری فقهـ بكە، منیش وتم: فەرموودە هەموو فقهـ كۆ دەكاتەوە، وتی: ئافرەتێك بڵێت سكم هەیە، مێردەكەشی ئینكاری لێ بكات و بڵێت منداڵی من نیە، چی دەڵێی دەربارەی ؟

منیش پێم وت : حدثني عباد عن عكرمة عن ابن عباس وتی : رسول الله ﷺ داوای *مولاعەنەی كردووە دەربارەی سكپڕی .

وكيع دەڵێت : أبو حەنیفە وازی لێ هێنام، دوای ئەمە هەر جارێك منی دیبوایە لە ڕێگایەك ڕێگایەكی تری دەگرتەبەر) .

نصيحة أهل الحديث

: مولاعەنە واتە ئافرەتەكە لەعنەت لەخۆی دەكات گەر زینای كردبێت، پیاوەكەش لەعنەت لەخۆی دەكات گەر بوهتانی هەڵبەستبێت بۆ ژنەكەی .

٤٨ - قال ابن حبان : أخبرنا زكريا بن يحيى الساجي بالبصرة قال حدثنا عصمة بن محمد قال حدثنا العباس بن عبد العظيم قال حدثنا أبو بكر بن أبي الأسود قال سمعت بشر بن المفضل :

وتی : وتم به ئەبو حەنیفە شعبة بۆی گێڕاینەوە لە هشام لە یزید ی کوڕی أنس لە أنس کە : یەهودیک سەری کۆیلەیەکی موسوڵمانی پانکردەوە لەنێوان دوو بەرد دا، جا رسول الله ﷺ سەری پان کردەوە لەنێوان دوو بەرد دا .

ئەبو حەنیفە وتی : ئەوە وڕێنەیە .

## المجروحين

٤٩ - حماد بن زيد وتی : (ئایا ئەزانن ئەبو حەنیفە چیی ئەکرد؟ لە ئیرجائدا دەمە دەمێ و موناقەشەی ئەکرد، پاشان قسەی کرد بە ڕەئی و فتوای پێدا، جا سوننەتەکانی رسول الله ی ﷺ قیاس کردە سەر یەک بۆ ئەوەی بەتاڵیان بکاتەوە، وە سوننەتەکانی رسول الله ﷺ قیاس ناکرێنە سەر یەک) .

## حلية الأولياء

٥٠ - سلام بن أبي مطيع وتی : (لەلای أيوب السختياني بووین، ئەبو حەنیفە هات بەرەوڕوومان، أيوب وتی : ' هەستن با تووشی گەڕیمان نەکات').

## حلية الأولياء

٥١ - إبن عبدالبر ئەڵێت : (ئەمە لەوانەیە کە ئەبو حەنیفەی پێ عەیبدار کراوە، وە ئەمە گەورەترین عەیب و تاوانیەتی لەلای ئەهلی فەرموودە کە عەیبەکانیان ڕوایەت کردووە، لەبەر پێچەوانەکردنی فەرموودە صحیح ـەکان و ڕەتکردنەوەی بە ڕەئ و بۆچوونی خۆی .

وە دەربارەی ئەو ئیرجائەی کە دراوەتە پاڵی بێجگە لە ئەو هەبووە کە زیاتر قووڵ بووەتەوە تیایدا و زیاتر بانگەوازی بۆ کردووە، وە لە هەمان کاتدا ئەهلی فەرموودە هێندەی نقڵ کردنی عەیبەکانی ئەبو حەنیفە خۆیان سەرقاڵ نەکردووە بە نقڵ کردنی عەیبەکانیەوە.

وە هۆکارەکەش تەنها ئەوەیە کە بۆم باسکردیت، لەبەر ئەوەی لێیان بینیوە لە وازهێنان لە سوننەت و ڕەتکردنەوەی بە ڕەئ و بۆچوونی خۆی، مەبەستم لە سوننەتە گێردراوەکانە بە ڕیوایەتی ڕاویە عادل ـە بێهاوتایە جێ متمانەکان، والله المستعان) .

التمهيد

: إبن عبدالبر بەرگریکارێکی زۆر توندە لە ئەبو حەنیفە، بەڵام لێرە ددان بە ڕاستیەکاندا ئەنێت و ئەیخاتە ڕوو کە ئەبو حەنیفە مورجیئە بووە، وە ئەمەش بەسە بۆ بە گومڕادانان و تەبدیعکردنی ئەبو حەنیفە، وە لەگەڵ ئەوەشدا بانگەوازی کردووە بۆ ئیرجائەکەی .

پاشان ڕوونی ئەکاتەوە کە چەندین فەرموودەی صحیح ی چەسپاوی بە ڕەئ و بۆچوونی خۆی ڕەتکردووەتەوە، ئەگەر یەکێک ئەمە حاڵی بێت شایەنی چییە؟ بێگومان بەلایەنی کەمەوە تەبدیعکردن و بە گومڕا دانان .

لەم حاڵەتانەدا ئەبێت دەرمارگیر بیت بۆ رسول الله ﷺ سوننەتەکەی، نەوەک دەرمارگیر بیت بۆ کەسێک کە بە هەوا و ئارەزووی خۆی سوننەتەکەی ڕەت ئەکاتەوە .

٥٢ - إبن كثير ئەڵێت : (ئەگەر البخاري دەربارەی کەسێک بڵێت (سكتوا عنه) یان (فيه نظر) ئەوە لە نزمترین و خراپترین پلەدایە) .

إختصار علوم الحديث : ص - ٢٠٢ : ت الفحل

ئیمامی البخاري لەبارەی هەڵوێستی ئەهلی سوننە بەرامبەر بە ئەبو حەنیفە ئەڵێت : (كان مرجئًا، سكتوا عنه وعن رأيه وعن حديثه) .

واتە : مورجیئە بوو، وازیان لە خۆی و ڕەئ و فەرموودەکانیشی هێنا.

التأريخ الكبير : القسم الثاني من جزء الرابع : ص - ٨١ : ت المعلمي

## باب (٧)

## پرسیار کرا دەربارەی ئەوەی جەهمیە گومڕاکان ڕەتیانکردووەتەوە لە بینینی پەروەردگار تبارك وتعالى لە ڕۆژی قیامەتدا



(لەلای هەموو گروپە جەهمیەکان الله تعالى بوونێکی خەیاڵی هەیە و بوونێکی حەقیقی نییە، هەربۆیە ئەڵێن دەستەکەی واتە نیعمەتەکەی، دابەزینەکەی واتە ڕەحمەتەکەی، وە چاوی واتە ئاگالێبوونی، وە نە لە سەرەوەیە، نە لە خوارەوە، نە لەلای چەپە، نە لەلای ڕاستە، وە شوێنی نییە، وە . . . چەندین کوفری دیکە .

جەهمیەکانی سەرەتا ئەیانوت الله عز وجل لە بەهەشتدا نابینرێت، ئەشعەریە جەهمیەکانیش تۆزێک قسەکەیان ئەمدیودیو کرد و وتیان ئەبینرێت بەڵام بەچاو نا، وە لە هیچ شوێنێک نییە کە ئەبینرێت، وە بینینی الله واتە زیادکردنی زانستێک لە دڵی بەندەیەکدا، جا ئەم قسەیانە هەموویان هەمان پێشەکی و هەمان ئەنجامیان هەیە .

واتە پێشەکی هەردوو وتەکە ئەوەیە کە الله تعالى بوونێکی حەقیقی نییە و لە هیچ شوێنێک نییە هەتا ببینرێت .

وه ئەنجامی هەردوو وتەکەش ئەوەیە کە الله تعالی لە بەهەشتدا نابینرێت، بەم شێوەیە هەردووکیان بینینی الله تعالی یان ڕەتکردنەوە کە لە قورئان و فەرموودە و چەندین وتەی سەلەفدا هاتووە.

بەڵام لای سەلەف رحمهم الله، الله تعالی بە چاوی سەر ئەبینرێت کاتێک الله لە بەرزیە لەلایەن ئیماندارانەوە، ئەمەش بە پشتبەستن چەندین ئایەتی قورئان و فەرموودەی زۆر زۆر ڕوونی رسول الله ﷺ.

ئەم دوو وتەیەی ئەم ئیمامانە بکە ڕێچکە و ڕێبازی خۆت لە بابەتی سیفاتەکانی الله تعالی دا:

١- سفيان بن عيينة (١٩٨ ھ) وتی: (هەموو وەسفێک کە الله وەسفی خۆی پێ کردووە لە قورئان، خوێندنەوەکەی تەفسیرەکەیەتی، نە چۆنیەتی و نە نمونە).

**كتاب الصفات لـ الدارقطني**

وتەی ئیمام: (خوێندنەوەکەی تەفسیرەکەیەتی نە چۆنیەتی و نە نمونە)

- (خوێندنەوەکەی تەفسیرەکەیەتی): واتە ئەوەی کە خوێندتەوە هەر ئەوە ماناکەیەتی، بۆ نمونە الله عز وجل ئەفەرموویێت کە لەسەر عەرش بەرزبووەتەوە، تەواو ئەوە مانای ئەوەیە، الله تعالی لە قورئاندا باسی سیفەتی دەستەکانی بۆ خۆی کردووە، کە خوێندتەوە و باسی دەستی کرد ئیتر هەر هەر ئەوە ماناکەیەتی کە خوێندتەوە.

- (نه چۆنیەتی ) واته : چۆنیەتی بۆ سیفەتەکەی الله تعالی دانانێین لەبەر ئەوەی نازانین دەستی چۆنە، وە نازانین چۆن بەرز بووەتەوە لەسەر عەرش .

- (نه نمونه) : واته نمونه بۆ سیفەتەکانی الله ناهێنینەوە، ناڵێین دەستی الله وەکو فلانە دەست وایە .

٢ - وکیع بن الجراح (١٩٧ ھ) وتی : (تەسلیمی ئەم فەرموودانە ئەبین هەر وەک ئەوەی کە هاتووە، وە ناڵێین : ئەمە چۆنە ؟ وە ئەمە چۆن هاتووە ؟) .

كتاب الصفات لـ الدارقطني

: واتە هەر فەرموودەیەکی سیفاتت پێگەیشت کە صەحیح بوو یان سەلەف وەریان گرتبوو مەڵێ چۆن ئەبێت الله تعالی وابێت؟ یان بۆچی وایە ؟ چونکە سەلەف لە تۆ شارەزاترن و فەرموودەکانیان وەکو خۆی قبووڵ کردووە بەبێ دوودڵی .

یەکێک لە جوانترین نمونەکان لە وەسفکردنی ئەو خوایەی کە جەهمیەکان ئەیپەرستن ئەمەیە :

- حماد بن زید (١٧٩ ھ) ئەڵێت :

نمونەی جەهمیەکان وەك پیاوێکە پێی بوترێت : ئایا لە ماڵەکەتدا دار خورما هەیە ؟

ئەڵێت : بەڵێ .

پێی بوترێت : گەڵای هەیە ؟

ئەڵێت : نەخێر .

لق و پۆپی هەیە ؟

ئەڵێت : نەخێر .

قەدی هەیە ؟

ئەڵێت : نەخێر .

ڕەگی هەیە ؟

ئەڵێت : نەخێر .

پێی ئەوترێت : کەواتە دار خورما نییە لە ماڵەکەتدا .

بەهەمان شێوە جەهمیەکان پێیان ئەوترێت : پەروەردگارتان هەیە ؟

ئەڵێن : بەڵێ .

پێیان ئەوترێت : قسە ئەکات ؟

ئەڵێن : نەخێر .

دەستی هەیە ؟

ئەڵێن : نەخێر .

قاچی هەیە ؟

ئەڵێن : نەخێر .

پەنجەی هەیە ؟

ئەڵێن : نەخێر .

ڕازی ئەبێت و توڕە ئەبێت ؟

ئەڵێن : نەخێر .

پێیان ئەوترێت : کەواتە ئێوە پەروەردگارتان نییە .

شرح مذاهب أهل السنة لإبن شاهين



١٨٧ - أبو عبدالرحمن عبدالله بن أحمد بن حنبل وتی : (باوکم بینی رحمه الله ئەو فەرموودەیانەی بە صحیح دائەنا کە لە رسول الله ﷺ ـەوە ئەگێڕدرانەوە دەربارەی الرُّؤية - بینینی الله تعالى لە بەهەشتدا - ، وە ئەوە مەزهەبی بوو، وە باوکم رحمه الله لە کتێبێکدا کۆیکردەوە و بۆی گێڕاینەوە) .

١٨٨ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (بە چاوتان پەروەردگارتان جل وعز ئەبینن) .

١٨٩ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (پەروەردگارتان جل وعز ئەبینن لە ڕۆژی قیامەتدا وەک چۆن مانگ ئەبینن، هیچ ناخۆشی و ئاستەنگیەک نایەتە ڕێتان لە بینینی) .

**١٩٠ - حسين بن علي الجعفي** فەرموودەی بینینی الله تعالى ی لە ڕۆژی قیامەتدا گێڕایەوە و وتی : (بە کوێرایی چاوی جهم و المريسي) .

---

**: بە کوێرایی چاوی ئەشعەریە جەهمیە زەندیقەکانیش (الغززالي، البيهقي، النووي، ابن حجر العسقلاني والهيتمي . . .)**

**١٩١ - وكيع بن الجراح** وتی : (هەرکەسێک ئەم فەرموودەیەی ڕەتکردەوە : (إسماعيل بن أبي خالد عن قيس عن جرير رضي الله عنه عن النبي ﷺ لە بینینی الله تعالى لە ڕۆژی قیامەتدا) ئەوە لە جەهمیەکان هەژماری بکەن) .

**١٩٢ - يزيد بن هارون** کاتێک تەواو بوو لە گێڕانەوەی فەرموودەی (إسماعيل بن أبي خالد عن قيس عن جرير رضي الله عنه عن النبي ﷺ : ئێوە پەروەردگارتان ئەبینن عز وجل وەک چۆن مانگ ئەبینن . . . ) وتی : (هەر کەسێک ئەم فەرموودەیە بەدرۆ بخاتەوە ئەوە بەریە لە الله عز وجل، وە بەریە لە رسول الله ﷺ) .

---

**: ئەشعەریە جەهمیەکان بە چەندین تەحریف و مانا گۆڕینی جۆراوجۆر ئەم فەرموودەیە ڕەت ئەکەنەوە و بگرە مانای حەقیقیەکەی بە کوفر و تەشبیهو تەجسیم ئەزانن.**

١٩٣ - وترا بە سفيان بن عيينة : (ئەو فەرموودەيانەی كە ئەگێڕدرێتەوە دەربارەی بينينی الله عز وجل لە قيامەتدا ؟

وتی : حەق و ڕاستە ، بيستوومانە لەوانەی كە سيقەمان پێيان هەيە و پێيان ڕازين ) .

---

- عباد بن العوام وتی : شريک بن عبدالله هاتە لای ئێمە، پێمان وت : ئەی باوكی عبدالله لێرە لای ئێمە كەسانێک لە موعتەزيلەكان ئينكاری ئەم فەرموودانە ئەكەن كە الله عزوجل دائەبەزێت بۆ ئاسمانی دونيا، وە كە ئەهلی بەهەشت پەروەردگاريان ئەبينن .

شريک دە فەرموودەی هاوشێوەی ئەم فەرموودانە گێڕايەوە بۆمان و وتی : ئەما ئێمە دينەكەمان وەرگرتووە لە كوڕەكانی تابعين، ئەوانيش لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ ئەی ئەوان لە كێيان وەرگرتووە ؟ ) .

كتاب الصفات لـ الدارقطني

: وتەكەی شريک بن عبدالله واتە ئێمە ئەم عەقيدەيەمان لە سەلەفی خۆمان كە ئەكاتە تابيعين وەرگرتووە، وە تابيعينيش لە هاوەڵانی رسول الله يان وەريان گرتووە، ئەی ئەم موعتەزيلەيانە سەلەفێكيان هەيە و لە كێ دينەكەيان وەرگرتووە ؟!!

- أبا رباب عقبة بن قبيصة بن عقبة وتی : ڕۆژێكيان چوين بۆ لای أبا نعيم، جا هاتە خوارەوە بۆلامان بەسەر ئەو پليكانەيەی لە ماڵەكەيدايە، وە دانيشت لە نێوانمان وا ديار بوو كە تووڕە بێت. دەستيپێكی قسە وتی : سفيان بن سعيد بن مسروق الثوري بۆی گێڕاينەوە، وە زهير بن معاوية بن حديج بن رحيل الجعفي بۆی گێڕاينەوە، وە حسن بن صالح بن حي بۆی گێڕاينەوە، وە شريک بن عبدالله النخعي بۆی گێڕاينەوە، ئەمانە كوڕەكانی موهاجيرەكانن قسەيان ئەكردوو و ئەيانگێڕايەوە كە الله ﷻ ئەبينرێت لە ڕۆژی قيامەتدا،

**هەتا کاتێک ئەم کوڕی یەهودی بۆیاخچییە هات و بانگەشەی ئەوەی کرد کە الله نابینرێت واتە : بشر المريسي .**

**كتاب الصفات لـ الدارقطني**

**١٩٤** - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (هیچ یەکێک لە ئێوە نییە ئیللا ئەگاتەوە بە الله عز وجل) یان (لە بەردەم الله عز وجل دا ئەوەستێنرێت، لەنێوانیاندا وەرگێڕ نییە، تەماشای چەپ و ڕاستی ئەکات هیچ نابینێت تەنها ئاگر نەبێت) .

**١٩٥** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (پەروەردگارتان عز وجل ئەبینن) .

وتیان : ئەی رسول الله ﷺ ئایا پەروەدگارمان ئەبینین ؟

فەرمووی : (ئایا لە نیوەڕۆدا هیچ ئاستەنگیەکتان دێتە پێش لە بینینی خۆر ؟) .

وتیان : نەخێر .

فەرمووی : (ئایا هیچ ئاستەنگی و ناخۆشیەکتان دێتە ڕێ لە بینینی مانگی چواردە لە شەودا ؟) .

وتیان : نەخێر .

فەرمووی : (جا ئێوەش هیچ ناخۆشی و ئاستەنگیەک نایەتە ڕێتان لە بینینی - الله عز وجل - وەک چۆن هیچ ئاستەنگی و ناخۆشیەکتان نایەتەڕێ لە بینینیان - واتە خۆر و مانگی چواردە - ) .

١٩٦ - أبي سعيد الخدري رضي الله عنه وتی : وتمان ئەی رسول الله ﷺ، ئایا لە قیامەتدا پەروەدگارمان جل و عز ئەبینین ؟

فەرمووی : (ئایا هیچ ئاستەنگیەک دێتە ڕێتان لە بینینی خۆر لە ڕۆژێکدا کە ئاسمان هیچ هەوری تێدا نەبێت ؟) .

وتمان : نەخێر .

فەرمووی : (ئایا هیچ ئاستەنگیەت دێتە ڕێتان لە بینینی مانگی چواردە لە شەوێکی سامالْدا کە هیچ هەوری تێدا نەبێت ؟) .

وتمان : نەخێر ئەی رسول الله .

فەرمووی : (جا ئێوەش هیچ ئاستەنگیەک نایەتە ڕێتان لە بینینی لە ڕۆژی قیامەتدا وەک چۆن ئاستەنگیەکتان نایەتەپێش لە بینینیان) .

١٩٧ - رسول الله ﷺ لەبارەی ئایەتی : | لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞۖ

| فەرمووی : | ٱلۡحُسۡنَىٰ | (بەهەشتە) .

وە | زِيَادَةٞۖ | (تەماشاکردنی ڕووی پەروەدگاریانە عز وجل) .

| وَلَا يَرۡهَقُ وُجُوهَهُمۡ قَتَرٞ وَلَا ذِلَّةٌۚ : تۆزی سەرشۆڕی لەسەر دەموچاویان نانیشێت | (پاش تەماشاکرنی پەروەدگاریان) .

١٩٨ - رسول الله ﷺ فەرمووی : | لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞۖ | : (ئەوە تەماشاکردنی الله یە عز وجل) .

١٩٩ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (هەر کە ئەهلی بەهەشت چوونە بەهەشتەوە، بانگ ئەکرێن : (ئەی ئەهلی بەهەشت، ئێوە مەوعیدێکتان هەیە).

ئەڵێن : مەوعیدەکە چییە ؟ ئەی تەرازووەکەمانی قورس نەکرد ؟ ئەی ڕووی سپی نەکردین ؟ وە نەیخستینە ناو بەهەشتەوە ؟ وە لە ئاگر ڕزگاری نەکردین ؟

فەرمووی : (جا الله عز وجل خۆی پیشانیان ئەدات و تەماشای ئەکەن، سوێند بە الله، الله هیچ شتێکی نەداونەتێ خۆشەویستر بێت بەلایانەوە لەمە) .

٢٠٠ - أبي رزين العقيلي رضي الله عنه وتی : وتم بە رسول الله ﷺ، پەروەردگارمان عز وجل لە کوێ بوو پێش ئەوەی دروستکراوەکانی دروست بکات ؟

فەرمووی : (لە عماء دا بوو، ژێرەوەی هەوا بوو وە سەرەوەی هەوا بوو، پاشان عەرشەکەی لەسەر ئاو دروست کرد) .

٢٠١ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (پەروەدگارمان عز وجل پێکەنی لە بێهیوابوونی بەندەکەی، وە نزیکی گۆڕانی بارودۆخی) .

أبو رزين وتی : (ئەی رسول الله ئایا پەروەردگاری گەورە عز وجل پێئەكەنێت ؟ هیوابڕاو نابین لە خێری پەروەدگارێک كە پێبكەنێت ) .

**٤٠٢** - **مجاهد بن جبر** وتی : (ئاسمانەكان و زەوی لەچاو كورسی - پەروردگاردا - وەكو ئەڵقەیەک وان لە زەویەكی چۆڵدا ) .

**٤٠٣** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (پەردەكە لائەدرێت و تەماشای ئەكەن ، سوێند بە الله ، الله هیچ شتێكی پێ نەداون خۆشەویستر بێت لەلایان لێی ) .

پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە : | **لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ** | .

**٤٠٤** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (نزمترین پلەی ئەهلی بەهەشت ئەوەیە كە دەڕوانێتە باخەكانی و خۆشگوزەرانیەكەی و خزمەتكارەكانی و جێگاكەی لە دووری هەزار ساڵەوە، وە بەڕێزترینیان لەلای الله عز وجل ئەوەیە تەماشای ڕووخساری ئەكات بەیانی و ئێوارە ) .

پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە : | **وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ** | (القيامة : ٢٣) .

**٤٠٥** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (پەروەردگاری ئێمە عز وجل خۆیمان پیشان ئەدات لە ڕۆژی قیامەتدا بە پێكەنینەوە ) .

٤٠٦ - پرسیاریان له وكیع كرد ده‌رباره‌ی فه‌رمووده‌ی بینینی الله عز وجل له قیامه‌تدا؟ جا گێڕایه‌وه، پاشان دووجار وتی: (جه‌همیه‌كان خه‌مبار بكه‌ن به‌م فه‌رمووده‌یه).

٤٠٧ - عامر بن سعد البجلي ئه‌ڵێت: (أبو بكر رضي الله عنه ئه‌مه‌ی خوێند - یان له‌لایدا خوێندرا - | لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞۖ |.

فه‌رمووی: (ئایا ئه‌زانن الزِّیادة چییه؟، بریتیه له ته‌ماشاكردنی په‌روه‌ردگارمان عز وجل).

٤٠٨ - أبو بكر رضي الله عنه له ته‌فسیری ئایه‌تی | لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞۖ |.

فه‌رمووی: (الزِّیادة ته‌ماشاكردنی ڕووی الله تعالی یه).

٤٠٩ - حذيفة بن اليمان رضي الله عنه له ته‌فسیری ئایه‌تی | لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞۖ |.

فه‌رمووی: (ته‌ماشاكردنی ڕووی الله عز وجل ـه).

٤١٠ - عبدالله بن عكيم وتی: (گوێم له إبن مسعود بوو رضي الله عنه پێش قسه‌كردن سوێندی خوارد پاشان فه‌رمووی: هیچ یه‌كێك نییه له ئێوه ئیللا

بەتەنها ئەبێت لەگەڵ پەروەدگاری عز وجل وەک چۆن بە تەنها ئەبێت لەگەڵ مانگی چواردەدا .

پێی ئەفەرمووێت : ئەی بەنی ئادەم چی وای لێ کردیت لووتبەرز بیت بەرامبەر من؟ ئەی بەنی ئادەم چیت وەڵامی نێرداوەکان دایەوە؟ چیت ئەنجامدا بەوەی کە زانیت؟) .

٤١١ - الحسن البصري وتی : (ئەگەر خواپەرستەکانی دنیا بیانزانیایە پەروەدگاریان عز وجل نابینن لە قیامەتدا ئەوە ڕۆئەچوون لە دنیادا) .

٤١٢ - سعيد بن جبير وتی : (ئەوانەی باشترین پلەیان هەیە - واتە لە بەهەشتدا - ئەوانەن کە بەیانی و ئێوارە تەماشای ڕووی الله عز وجل ئەکەن) .

---

- عثمان الدارمي (٢٨٠ هـ) ئەڵێت : (جا ئەم فەرموودەیانەی لەبارەی بینینەوە ڕیوایەت کراون ئەهلی فیقهـ و شێخەکانمان بینیوە لەسەر قبووڵکردن و ئیمان پێهێنانی، وە لەو کاتەوە هەتا ئێستاش موسوڵمانان لە تازە و کۆندا ڕیوایەتی ئەکەن و ئیمانی پێ ئەهێنن و ڕەتی ناکەنەوە، وە هەر کەسێک ڕەتی کردبێتەوە داویانەتە پاڵ گومڕایی، بەڵکو گەورەترین ئاوات و پاداشتیان لەلای ئەوان بریتیە لە تەماشاکردنی ڕووی پەروەردگاریان تبارك وتعالى، وە هیچ نیعمەتێکی بەهەشت یەکسان ناکەن بەو نیعمەتە) .

الرد على الجهمية

- إبن خزيمة (٣١١ هـ) ئەڵێت : (هاوەڵان و تابیعین و شوێنکەوتوانیان و ئەوانەی پاش ئەوان هاتوون رحمهم الله هەتا ئەگاتە ئەو زانایانەی بینیومانن لە سەردەمی ئێمەدا هیچ ڕاجیاوازیەک و هیچ گومان و دوو دڵیەکیان نییە کە هەموو ئیمانداران بە چاوی خۆیان پەروەردگاریان عز وجل ئەبینن) .

## كتاب التوحيد

- الآجري (٣٦٠ ھ) ئەڵێت : (وە زۆر فەرموودەی سەحیح هاتووە لە رسول الله ـەوە ﷺ لەبارەی تەماشاکردنی ڕووی الله عز وجل، وە ئەهلی عیلمیش بە باشترین شێواز وەریانگرتووە) .

## كتاب الشريعة

- أبو عبدالله إبن مندة (٣٩٥ ھ) ئەڵێت : (الله عز وجل ئەفەرموویت : | وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ * إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ : ئەو ڕۆژە ڕووخسارگەلێکی جوان تەماشای پەروەردگاریان ئەکەن | (القِيَامَة : ٢٢ - ٢٣)

زانایانی تەفسیر وەکو إبن عباس و هاوەڵانی تر، وە لە تابیعین وەکو محمد بن کعب القرضي و، عبدالرحمن بن سابط و، الحسن بن أبي الحسن و، عکرمة و، أبو صالح و سعید بن جبیر و بێجگە لەوانە ئەڵێن ماناکەی بریتیە لە : (تەماشای ڕووی پەروەردگاری ئەکات) .

- اللالكائي (٤١٨ ھ) لە یحیی من معین ـەوە هێناویەتی کە ئەڵێت : لەبارەی بینین - واتە بینینی الله عز وجل - حەڤدە فەرموودەم لایە کە هەموویان سەحیحن .

وە اللالكائي ئەڵێت : فەرموودەی بینین - ی الله تعالى - لە رسول الله ـەوە ﷺ ڕیوایەت کراوە لەلایەن بیست و سێ هاوەڵەوە .

- اللالكائي لە تەفسیری ئایەتی : | وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ * إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ | ئەڵێت لە إبن عباس ـەوە ڕیوایەت کراوە کە ئەڵێت : (واتە تەماشاکردنی الله عز وجل)، وە لە تابعیەکان الحسن، عکرمة، مجاهد، محمد بن علي بن حسین، زید بن علي بن حسین قتادة و الضحاک بن مزاحم هەمان شتیان وتووە . وە لە فەقیهەکانیش مالک و الشافعي بەڵگەیان بەم ئایەتە هێناوەتەوە بۆ بینینی الله .

## شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة

- إبن تيمية (٧٢٨) ئەڵێت : (سەلەفی ئوممەت كۆدەنگی - ئیجماع - یان هەیە لەسەر ئەوەی كە ئیمانداران بە چاویان پەروەردگاریان ئەبینن) .

مجموع الفتاوى

- إبن قيم (٧٥١ هـ) لەبارەی بینینی الله عز وجل لە بەهەشتدا ئەڵێت : ٠پێغەمبەران و هاوەڵان و تابیعین و پێشەوایانی ئیسلام لە هەموو سەردەمەكاندا كۆدەنگیان هەیە لەسەری) .

حادي الأرواح إلي بلاد الأفراح

## باب : (٨)

## پرسيار كراوه ده‌رباره‌ی ئه‌وه‌ی له پێغه‌مبه‌ره‌وه ﷺ ڕیوایه‌ت كراوه كه الله ﷻ ئاسمانه‌كان هه‌ڵئه‌گرێت له‌سه‌ر په‌نجه‌یه‌ك، وه هاوشێوه‌ی ئه‌وه له فه‌رمووده‌كان



(وه‌كو له چه‌ندین فه‌رمووده‌ی صحيح دا هاتووه الله تعالى په‌نجه‌ی هه‌یه، وه ئیمامی الشافعي له عه‌قیده‌كه‌یدا به ڕیوایه‌تی الهكاري له خاڵی یانزه‌یه‌مدا ده‌رباره‌ی الله عز وجل ئه‌ڵێت : ( وه په‌نجه‌ی هه‌یه، له‌به‌ر فه‌رمووده‌ی : هیچ دڵێك نییه ئیللا له نێوان دوو په‌نجه له په‌نجه‌كانی الرحمن دایه ) .

سیفه‌تی په‌نجه ش وه‌كو ته‌واوی سیفه‌ته‌كانی تر سه‌له‌ف رحمهم الله جێگیریان كردووه، وه به‌ڕاستخه‌ره‌وه‌كه‌ی له قورئاندا هاتووه، له به‌رامبه‌ردا هه‌موو گروپه جه‌همیه‌كانیش ڕه‌تی ئه‌كه‌نه‌وه و قورئان و فه‌رمووده به‌درۆ ئه‌خه‌نه‌وه ) .



٢١٣ - أبو عبدالرحمن عبدالله بن الإمام أحمد ئەڵێت : باوكم رحمه الله بۆی گێڕامەوە وتی، يحيى بن سعيد بۆی گێڕاینەوە لە سفيان وتی، بۆی گێڕامەوە منصور و سليمان لە أبراهيم لە عبيدة، لە عبد الله رضى الله عنه ئەفەرمووێت : يەهودييەك هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پێی وت : ئەی محمد، الله عز وجل ئاسمانەكان لەسەر پەنجەيەكی هەڵدەگرێت، وە زەويەكان لەسەر پەنجەيەكی، وە خاك و خۆڵ لەسەر پەنجەيەكی، وە شاخەكان لەسەر پەنجەيەكی، وە درووستكراوەكانی تر لەسەر پەنجەيەكی، پاشان ئەفەرمووێت : (من پادشام) .

رسول الله ﷺ پێكەنی هەتا ددانە چوارینەكانی دەركەوت وە ئەم ئايەتەی خوێندەوە : | وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ | (الأنعام : ٩١) .

باوكم وتی يحيى وتی فضيل بن عياض وتی : (رسول الله ﷺ پێكەنی بەهۆی سەرسوڕمان و بەڕاستدانانی بۆی) .

٢١٤ - أبو عبدالرحمن عبدالله بن الإمام أحمد ئەڵێت : گوێم لە باوكم بوو رحمه الله ئەيوت يحيى بن سعيد فەرموودەكەی، سفيان لە أعمش و منصور، لە إبراهيم، لە عبيدة، لە عبد الله، لە پێغەمبەر ﷺ : (بەڕاستی الله عز وجل ئاسمانەكان لەسەر پەنجەيەكی هەڵدەگرێت) بۆ باس كردين .

باوكم رحمه الله وتی : وە يحيى ئاماژەی بە پەنجەكانی ئەكرد .

وە باوكم بينی چۆن ئيشارەتی بە پەنجەكانی ئەكرد، پەنجە لە دوای پەنجە دايدەنا هەتا گەيشت بە كۆتا پەنجە .

: واتا سەلەف رحمهم الله لە فەرموودەكە تێگەیشتوون و سیفەتی پەنجەیان بۆ الله تعالى جێگیر كردووە بە شێوەیەک كە شایستەیەتی، ئەمەش ڕەددێكە بۆ موفەویضەكان كە ئەڵێن سەلەف لە مانای ئایەتەكانی سیفات تێنەگەیشتوون .

**٢١٥ - عبد الله بن مسعود** رضی الله عنه فەرمووی : زانایەكی جولەكەكان هات بۆ لای رسول الله ﷺ وتی : ئەی محمد یان ئەی رسول الله، الله عز وجل لە ڕۆژی قیامەتدا ئاسمانەكان دەخاتە سەر پەنجەیەكی، وە زەویەكان لەسەر پەنجەیەكی، وە شاخەكان لەسەر پەنجەیەكی، وە دار و درەخت لەسەر پەنجەیەكی، وە ئاو و خاك و خۆڵ لەسەر پەنجەیەكی، وە باقی دروستكراوەكانی تر لەسەر پەنجەیەكی، پاشان ئەیانلەرزێنێت، جا ئەفەرمووێت : من پادشام .

وتی : رسول الله ﷺ پێكەنی هەتا ددانە چوارینەكانی دەركەوت لە بەڕاست دانانی وتەی زانا جولەكەكە .

وە پاشان رسول الله ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە : | **وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ** | (الزمر : ٦٧) هەتا كۆتایی ئایەتەكە .

**٢١٦ - ابن عباس** رضی الله عنهما فەرمووی : (جولەكەیەك بەلای پێغەمبەر ﷺ دا ڕۆشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێی : (**ئەی جولەكە بمانترسێنە**) .

وتی : ئەی أبا قاسم، چۆن ئەبێت ڕۆژێك، زەوی لەسەر ئەمە ئەبێت، وە ئاسمانەکان لەسەر ئەمە، وە ئاو لەسەر ئەمە، وە دروستکراوەکانی تر لەسەر ئەمە - واتە : پەنجەکانی- ، پاشان رسول الله ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە : | وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ | (الزمر : ٦٧) .

٢١٧ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەگەر یەکێکتان دای - لە کەسێك - ئەوا با دوور بکەوێتەوە لە لێدانی ڕووخسار چونکە الله ئادەمی لەسەر وێنەی خۆی درووست کردووە) .

---

- الكوسج رحمه الله ئەڵێت : (دەربارەی ئەم فەرموودەیە ' لَا تُقَبِّحُوا الْوَجْهَ فَإِنَّ اللَّهَ عزوجل خَلَقَ آدَمَ عَلَى صُورَتِهِ ' پرسیارم لە أحمد کرد .

أحمد وتی : صحيح ـه .

إسحاق - واتە إبن راهويه - وتی : صحيح ـه) .

السنة لـ الخلال

- إبن تيمية ئەڵێت : (لەناو سەلەفدا هیچ خیلافێک نەبوو لە هەر سێ سەدەکە لە جێناوی وشەی (صورَتِهِ) ئەگەڕێتەوە بۆ الله، وە لە چەندین ڕێگاوە هاتووە لە چەندین هاوەڵەوە، وە سیاقی فەرموودەکان هەموویان بەڵگەن لەسەری) .

بيان تلبيس الجهمية في تأسيس بدعهم الكلامية

واتە جێناوی (هاء = ه) ی کۆتایی وشەی (صورَتِهِ) ئەگەڕێتەوە بۆ الله، بەڵام جەهمیەکان جارێک ئەیگەڕێننەوە بۆ پیاو، جارێک بۆ قوڕ، یان بۆ هەر شتێکی تر تا خۆیان لە مانای حەقیقی فەرموودەکە بدزنەوە و خۆیان تووشی کوفر بکەن .

بۆ زیاتر تێگەیشتن بە بابەتەکە ئەتوانن ئەم نامیلکەیە بخوێننەوە :

تێگەیشتن لە فەرموودەی : (ان الله خلق آدم على صورته)

https://t.me/Ktebxanay_salaf1/172

٢١٨ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (ناشرینی مەدەنە پاڵ ڕووخسار چونکە الله عز وجل ئادەمی لەسەر وێنەی الرحمن دروست کردووە) .

٢١٩ - إبن رواحة بە الحسن البصري وت : ئایا وەسفی پەروەردگارت عز وجل ئەکەیت ؟

فەرمووی : (بەڵێ ، وەسفی دەکەم بەبێ دانانی هاوشێوە بۆی) .

٢٢٠ - أبو عبدالرحمن عبدالله بن الإمام أحمد وتی : إبراهيم بن حجاج الناجي بۆ باسکردم وتی ، حماد کوڕی سلمة بۆی باسکردین لە ثابت البناني ، لە أنس کوڕی مالك رضي الله عنه : | فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ | (الأعراف : ١٤٣) .

حماد وتی : بەو شێوەیە ، وە إبراهيم نوکی پەنجە تووتەی نیشان داین .

وتم بە إبراهيم : بەرزی کردەوە - واتە دایە پاڵ رسول الله ﷺ - ؟

وتی : نەخێر .

٢٢١ - أبا عبيد القاسم بن سلام وتی : (قسەم لەگەڵ خەڵكی كرد، وە قسەم لەگەڵ ئەهلی كتاب كرد، نەمبینی قەومێك چەپەڵتر و پیستر و قسە پیستر لە ڕافیزە، وە من سێ دانە پیاوم دەركرد كاتێك قازی بووم لە سەنگەردا، دوو جەهمی و ڕافیزەیەك، یان دوو ڕافیزە و جەهمیەك، وە وتم : كەسانی وەك ئێوە نزیكی ئەهلی سەنگەرەكان نابێتەوە).

٢٢٢ - عباد بن عوام وتی : شريك هاتە لامان، پرسیارمان لێكرد دەربارەی فەرموودەی : الله شەوی نیوەی شەعبان دادەبەزێت ؟

وتمان : قەومێك هەن ئینكاری ئەم فەرموودانە ئەكەن !

وتی : (جا چی ئەڵێن ؟).

وتمان : تانەی لێئەدەن .

وتی : (ئەوانەی كە ئەم فەرموودانەیان گێڕاوەتەوە، هەر ئەوانەن كە باسی قورئان و پێنج نوێژەكە و حەج و ڕۆژووی ڕەمەزان، : جا الله عز وجل ناناسین ئیللا بەم فەرموودانە نەبێت).

---

**: ئەشعەریە جەهمیەكانیش جەهلی كەلام بەكارئەهێنن بۆ پووچەڵكردنەوەی مانای حەقیقی فەرموودەكان .**

٢٢٣ - إسماعيل بن علية دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : | لَا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ | (الأنعام : ١٠٣) .

وتی : (ئەمە لە دونیادایە) .

٢٢٤ - أبو عبدالرحمن عبدالله بن الإمام أحمد وتی : محمد بن منصور الطوسي بۆی گێرامەوە وتی، علی بن مضاء مەولای خالد القسری هات، بۆی باسکردین هشام بن بهرام وتی گوێم لە معافی کوڕی عمران بوو وتی : (قورئان وتەی الله یە مەخلوق نییە .

هشام وتی : وە من وەك ئەوە ئەڵێم کە المعافی وتی .

علی وتی : وە من وەك ئەوە ئەڵێم کە وتی، واتە : هشام .

أبو جعفر الطوسي وتی : وە منیش ئەڵێم قورئان وتەی الله یە مەخلوق نییە) .

٢٢٥ - عباد بن عوام وتی : قسەم لەگەڵ بشر المريسي و هاوەڵانی بشر کرد، بینیم کۆتایی قسەکەیان ئەگەیشتەوە بەوەی بڵێن : لە هیچ لە ئاسمان نییە - واتە الله عز وجل لەسەر عەرش نییە - ) .

---

: ئەشعەریە جەهمیەکانیش هەمان عەقیدەیان هەیە، بەڵکو تەکفیری ئەو کەسەش ئەکەن کە الله تعالى و پێغەمبەرەکەی ﷺ بەڕاست بخاتەوە و بڵێت الله عز وجل لەسەر عەرشە.

٢٢٦ - عبيد وتی : (باشترین ڕۆژێک کە خۆری بەسەردا هەڵهاتبێت ڕۆژی جومعە یە، تێیدا ئادەم دروستکرا علیه السلام، وە تێیدا قیامەت هەڵئەستێت، وە الله عز وجل ئادەمی ی لەسەر وێنەی خۆی دروست کرد، پاشان پژمی وە الله عز وجل خستیە سەر زمانی کە بڵێت : الحمد الله رب العالمین .

جا فەرمووی : (پەروەردگارت ڕەحمی پێ کردیت) .

٢٢٧ - كعب الأحبار ئەڵێت : (هیچ ڕۆژێک نییە ئیللا الله عز وجل دەرئەکەوێت بۆ بەهەشتی عدن، پێی ئەفەرمووێت : (خۆشتر بە بۆ ئەهلەکەت).

جا ئەوەی بەهەشت لەناویدایەتی چەند قات زیاتر ئەبێت هەتا ئەهلەکەی ئەڕۆنە ناوی) .

٢٢٨ - أبو عبدالله السلمي وتی پرسیارم کرد لە أبو يعقوب الخزاز إسحاق بن سليم دەربارەی قورئان ؟

وتی : (کەلامی الله عز وجل ە، وە غیر مخلوق ە) .

پاشان پێی وتم : (ئەگەر ئێمە تەنها بڵێین قورئان کەلامی الله یە، وە نەڵێین مخلوق ە، یان غیر مخلوق، ئەوە هیچ جیاوازیەک نییە لە نێوان ئێمە و ئەواندا، واتە جەهمیەکان .

ئەمەم باس کرد بۆ أحمد بن حنبل رضي الله عنه، پێی وتم : (الله پاداشتی خێری أبا يعقوب بداتەوە) .

**٢٢٩** - **يزيد بن هارون** وتی : (ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌ی له بشر المريسي ئه‌گێڕدرێته‌وه ڕاست بێت، ئه‌وه ڕشتنی خوێنی حه‌ڵاڵه) .

## باب : (٩)

## پرسیار کراوە دەربارەی ئەوەی جەهمیە گومڕاکان ڕەتیان کردووەتەوە لە قسەکردنی رب العالمین عز وجل لەگەڵ موسی بن عمران علیه السلام



(جەهمیەکان پێیان وایە الله تعالی قسە ناکات، هەربۆیە وتیان قورئان مخلوق ە، پاشان ناچاربوون قسەکردنی الله تعالی لەگەڵ موسی علیه السلام ڕەتبکەنەوە، چونکە ئەو دوو بابەتە پەیوەندیەکی تەواویان پێکەوە هەیە .

ئیمام ئەحمەد وتی : (ئەوەی پێی وابێت الله قسەی لەگەڵ موسی ـدا نەکردووە ئەوە کافرە بە الله، وە قورئانی بەدرۆخستووەتەوە، وە ڕەدی ئەوەی کردووەتەوە کە پێغەمبەری الله پێی هاتووە، داوای تەوبەی لێ ئەکرێت لەسەر ئەم قسەیەی، ئەگەر تۆبەی نەکرد لە ملی ئەدرێت) .

كتاب السنة لغلام الخلال / باب في إثبات الكلام : ٣١



٢٣٠ - عبدالرحمن بن مهدي ئەڵێت: (هەر کەسێک وا گومان ببات الله عز وجل قسەی لەگەڵ موسى دا نەکردووە علیه السلام، ئەوە تۆبەی پێ ئەکرێت، ئەگەر تۆبەی نەکرد لە ملی ئەدرێت).

٢٣١ - أبو عبدالرحمن عبدالله بن الإمام أحمد ئەڵێت: پرسیارم کرد لە باوکم رحمه الله دەربارەی کەسانێك کە ئەڵێن: کاتێك الله عز وجل قسەی لەگەڵ موسى دا کرد بە دەنگ قسەی لەگەڵدا نەکرد؟

باوکم فەرمووی: (بلی، پەروەردگارت عز وجل بە دەنگ قسەی کرد، ئەم فەرموودەیانە ئەگێڕینەوە وەك چۆن هاتوون).

وە باوکم رحمه الله وتی: (فەرموودەی ابن مسعود رضي الله عنه: کاتێك الله عز وجل قسە ئەکات دەنگی ئەبیستن وەك ڕاکێشانی زنجیرێکە لەسەر بەردێکی سافدا).

باوکم رحمه الله وتی: (وە ئەمە جەهمییەکان ئینکاری لێئەکەن و ڕەتی ئەکەنەوە).

باوکم وتی: (ئەوانە کافرن، ئەیانەوێت سەر لە خەڵکی بشێوێنن، هەر کەسێك وا گومان ببات کە الله عز وجل قسەی نەکردووە ئەوا کافرە، ئەم فەرموودانە وەك چۆن هاتوون ئەیانگێڕینەوە).

---

**المروذي رحمه الله وتی: گوێم لە باوکی عبدالله - ئیمام ئەحمەد - بوو پێی وترا: عبدالوهاب وتوویەتی: ئەوەی وا گومان ببات الله بەبێ دەنگ (بلا صوت) قسەی لەگەڵ موسى دا کردووە ئەوە جەهمیە، دوژمنی الله ـە، دوژمنی ئیسلامە.**

باوکی عبدالله زەردەخەنەی کرد و وتی : چەندە باشی وتووە، الله لێی خۆش بێت.

**درء تعارض بين العقل والنقل**

ئەشعەریە جەهمیەکانیش پێیان وایە کە الله عز وجل قسە ناکات، وە قسەکردنی الله بریتیە لە کەلامێک لە نەفسی الله تعالی ـدا، ئەگەر بیەوێت قسە بکات ئەوکات ئەبێت قسەکەی خۆی دروست بکات، هەربۆیە لەلای ئەوان کەلامی الله بە دەنگ نییە، ئەم هەموو داهێنانەیان کرد لە دیندا و خۆیان کافر کرد تەنها بۆ ئەوەی ئەوە جێگیر نەکەن کە الله تعالی بۆ خۆیی جێگیر کردووە و رسول الله ﷺ و سەلەف بۆیان جێگیر کردووە، وە ئەو تەکفیرکردنی ئیمام ئەحمەد رحمه الله بە پلەی یەکەم ئەشعەریە جەهمیەکان ئەگرێتەوە، ئەمەش وتەی هەندێک ئەشعەری جەهمیە دەربارەی نەفی کردنی دەنگ :

١ - الباقلاني لە (الإنصاف) ئەڵێ : گونجاو نییە ئاماژەکانی دروستکراوێتی وەکو حرف و صوت بۆ کەلامەکەی - الله - بەکاربهێنرێت.

٢ - البيهقي لە (الأسماء والصفات) لەبارەی الله ـەوە قسە ئەکات و پاشان ئەڵێ : کەلامەکەی کە حرف و صوت نییە.

٣ - الجويني لە (الإرشاد) کەلامی نەفسی جێگیر ئەکات و نەفی حرف و صوت ئەکات.

٤ - ابن عطية لە (المحرر الوجيز) وە القرطبي لە (المفهم في شرح مسلم) و إبن حجر العسقلاني لە (فتح الباري) و البيجوري لە (شرح جوهرة) نەفی حرف و صوت ئەکەن بۆ الله تعالی .

٢٣٢ - **أبا معمر الهذلي** وتی : (هەر کەس پێی وابێت الله عز وجل قسە ناکات و نابیستێت و نابینێت و توورە نابێت و ڕازی نابێت و) چەند شتێکی تری

باسکرد لەو سیفاتانە (ئەوە کافرە بە الله عز وجل، ئەگەر بینیتان ڕاوەستا بوو لەسەر بیرێك ئەوا فرێی بدەنە ناو بیرەکەوە، بەمە دینداری الله عز وجل ئەکەم چونکە ئەوانە کافرن بە الله تعالى).

**٢٣٣** - **عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه فەرمووی : (کاتێک الله عز وجل قسە ئەکات بە وەحی ئەهلی ئاسمان گوێیان لە زرینگەیەک ئەبێت وەکو زرینگەی - تێپەڕبوونی - ئاسن بەسەر بەردێکی سافدا).

**٢٣٤** - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (الله عز وجل قسەی لەگەڵ موسی دا کرد بە سەد و جل هەزار وشە و ڕستە لە سێ ڕۆژدا، هەموویان وەسیەت و ئامۆژگاری بوون، کاتێک موسی گوێبیستی قسەی بەنی ئادەمەکان بوو ڕقی لێیان ئەبوویەوە لەبەر ئەوەی گوێبیستی کەلامی الله بوو بوو، لەوەی کە الله قسەی لەگەڵدا کرد ئەمەی تێیدا بوو : ئەی موسی کارکەرەکان کارێکیان نەکردووە بۆم هاوشێوەی دنیانەویستی، وە ئەوانەی کە نزیکن لێم نزیک نەبوونەتەوە لێم بە هاوشێوەی خۆپاراستن لەوەی کە حەرامم کردووە لەسەریان، وە خواپەرستەکان خواپەرستیەکیان نەکردووە هاوشێوەی گریان لە ترسم.

موسی وتی : ئەی پەروەردگاری هەموو بوونەوەران، وە خاوەنی ڕۆژی کۆتایی، ئەی خاوەن شکۆ و ڕێز، چیت بۆ داناون؟ وە چ پاداشتێکت داونەتەوە؟

فەرمووی : هەرچی دنیا نەویستەکانە بەهەشتەکەمیان بۆ حەڵاڵ ئەکەم دێن و ئەڕۆن لەناویدا بۆ هەر شوێنێک بیانەوێت.

وه‌ هه‌رچی خۆپارێزه‌كانه‌ له‌وه‌ی كه‌ حه‌رامم كردووه‌ له‌ ڕۆژی قیامه‌تدا هیچ به‌نده‌یه‌ک نییه‌ ئیللا لێپرسینه‌وه‌ی له‌گه‌ڵدا ئه‌كه‌م، وه‌ لێی ئه‌كۆڵمه‌وه‌ له‌وه‌ی كه‌ پێشی خستووه‌ ته‌نها خاوه‌ن وه‌رعه‌كان نه‌بێت، جا من ڕێزیان لێ ئه‌گرم و ئه‌یانخه‌مه‌ به‌هه‌شته‌وه‌ به‌بێ لێپرسینه‌وه‌ .

وه‌ هه‌رچی ئه‌وانه‌یه‌ كه‌ گریاون له‌به‌ر ترسی من ئه‌وانه‌ پله‌ به‌رزه‌كانی به‌هه‌شتیان بۆ هه‌یه‌ كه‌ هیچ كه‌سێک به‌شدار نابێت له‌گه‌ڵیاندا) .

٢٣٥ - أبي الحويرث وتی : (الله‌ عز وجل قسه‌ی له‌گه‌ڵ موسی علیه‌ السلام كرد هێنده‌ی موسی به‌رگه‌ی ئه‌گرت له‌ قسه‌كانی، ئه‌گه‌ر بێتو قسه‌ی له‌گه‌ڵ بكردایه‌ به‌ هه‌موو قسه‌كانی، به‌رگه‌ی هیچ شتێكی نه‌ئه‌گرت) .

٢٣٦ - إبن شوذب وتی : (الله‌ عز وجل وه‌حی بۆ موسی علیه‌ السلام كرد فه‌رمووی : ئه‌ی موسی، ئایا ئه‌زانیت بۆچی تۆم هه‌ڵبژاردووه‌ به‌ قسه‌ كردنه‌كه‌م و په‌یامه‌كه‌م ؟

وتی : نه‌خێر ئه‌ی په‌روه‌ردگار .

فه‌رمووی : له‌به‌ر ئه‌وه‌ی هه‌رگیز هیچ كه‌سێك خۆی به‌ كه‌م نه‌زانیوه‌ به‌رامبه‌رم وه‌ك خۆبه‌كه‌مزانینه‌كه‌ی تۆ) .

٢٣٧ - عبد الله‌ بن شقیق ئه‌ڵێت : (به‌ أبي ذر م وت رضي الله‌ عنه‌ : ئه‌گه‌ر پێغه‌مبه‌ر ﷺ م بینیبایه‌ ئه‌وا پرسیارم لێئه‌كرد ئایا په‌روه‌ردگاری عز وجل بینیوه‌ ؟

وتی : پرسیارم لێکردووە، فەرمووی بینیومە ) .

٢٣٨ - **عبد الله بن مسعود** رضي الله عنه فەرمووی : (چووم بۆ شام ڕۆیشتم بە لای ئەو دارەی کە موسی علیه السلام ی لێوە بانگکرا بوو، ڕەنگەکەی سەوزێکی گەشاوە بوو) .

٢٣٩ - **نوف** وتی : (موسی علیه السلام کاتێك بانگکرا وتی : تۆ کێیت ئەوەی بانگم ئەکەیت ؟

فەرمووی : من پەروەردگاری هەرە بەرزی تۆم ) .

٢٤٠ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (**کاتێك موسی علیه السلام قسەی لەگەڵ پەروەردگاری کرد عزوجل، جبە و جامانەیەکی خووری لەسەردا بوو، وە نەعلەکانی لە پێستی گوێدرێژێکی مرداروەبوو بوو**) .

٢٤١ - **کعب** وتی : (الله عز وجل تەوڕاتی بە دەستی خۆی نووسی ) .

٢٤٢ - **حکیم بن جابر** وتی : (هەواڵم پێدراوە کە الله عز وجل ئادەمی بە دەستی خۆی دروست کردووە، وە تەوڕاتی بە دەستی خۆی نووسیوە بۆ موسی علیه السلام) .

٢٤٣ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (بەڕاستی الله عز وجل بە دەستی خۆی لەسەر نەفسی خۆی نووسیوە كاتێك كە دروستكراوەكانی دروست كرد : ڕەحمەتم زاڵە بەسەر تورە بوونم دا) .

٢٤٤ - ميسرة دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل بۆ موسى عليه السلام | وَقَرَّبْنَاهُ نَجِيًّا | (مريم : ٥٢)

وتی : (نزیك كرایەوە هەتا گوێی لە دەنگی قەڵەمەكە بوو لەسەر لەوحەكان، وە - الله عز وجل - تەوراتی بە دەستی خۆی نووسی) .

٢٤٥ - عكرمة وتی : (بەڕاستی الله عز وجل دەستی نەداوە لە هیچ شتێك ئیللا سێ شت نەبێت : ئادەمی دروست كرد بە دەستی خۆی، وە بەهەشتی چاند بە دەستی خۆی، وە تەوراتی نووسی بە دەستی خۆی) .

٢٤٦ - زيد بن أسلم وتی : (كاتێک الله عز وجل تەوراتی بە دەستی خۆی نووسی فەرمووی : ' بسم الله ئەمە كتێبی الله یە بە دەستی خۆی بۆ بەندەكەی موسى، بۆ ئەوەی بە بەرز و پیرۆزم ڕابگرێت، وە سوێند نەخوات بە ناوی من بە درۆوە، چونكە من كەسێك پاك ناكەمەوە كە سوێند بخوات بە ناوی من بە درۆوە) .

٢٤٧ - عبدالله بن عباس رضي الله عنه فەرمووی : (خۆشەویستی بۆ إبراهيم و قسە لەگەڵکردن بۆ موسى و بينين بۆ محمد ـ سەلامی الله لەسەر هەموویان بێت) .

٢٤٨ - محمد بن عبيد وتی : (أحمد بن نصر م بينی لە خەونمدا، پێم وت : ئەی باوكی عبدالله پەروەردگارت عز وجل چی لەگەڵ كرديت ؟

وتی : لەپێناوی توورە بووم، جا ڕێگەی دام بە تەماشاكردنی ڕووی عز وجل) .

---

: أحمد بن نصر الخزاعي ئەو زانا بەڕێزە بوو كە لە سەردەمی الواثق ی جەهميدا ويستی لەسەری دەربچێت، هەربۆيە الواثق گرتی و ملی پەڕاند، وە ئیمام أحمد يش ڕەحمەتی بۆ نارد .

٢٤٩ - وردان أبي خالد وتی : (الله عز وجل ئادەم ی صلوات الله عليه دروست كردووە بە دەستی خۆی، وە جبريل عليه السلام ی دروست كردووە بە دەستی خۆی، وە عەرشی دروست كرد بە دەستی خۆی، وە قەڵەمی دروست كرد بە دەستی خۆی، وە تەوراتی نووسی بە دەستی خۆی، وە ئەو كتێبەی كەس ناتوانێت ببينێت لای خۆيەتی بە دەستی نووسی) .

## باب : (١٠)

## پرسیاری لێكرا دەربارەی كورسی و دانیشتنی پەروەردگار عز وجل لەسەری



(وەک چۆن الله عز وجل عەرشی هەیە، بە هەمان شێوە كورسی هەیە تبارك و تعالى، لە ئەثەرەكانی دواتردا ڕوونكردنەوەی زیاتری تێدایە دەربارەی ئەو كورسیە) .



**٤٥٠** - پرسیاری لێكرا - **واتە لە عبدالله ی كوڕی ئیمام أحمد** - دەربارەی ئەوەی گێڕدراوەتەوە لەبارەی كورسی و دانیشتنی پەروەردگار عز وجل لەسەری ؟

وتی : (بینیم باوكم رحمه الله ئەو فەرموودەیانەی بە صحیح دائەنا، فەرموودەكانی بینین، وە ئەوە بۆچوون و مەزهەبی بوو، وە كۆی كردەوە لە كتێبێكدا و بۆی گێڕاینەوە) .

**٢٥١ - عمر بن الخطاب** رضي الله عنه فەرمووی : (کاتێک پەروەردگار تبارک و تعالی لەسەر کورسی دائەنیشێت، دەنگێک ئەبیسترێت وەکو دەنگی سواریەکی نوێ) .

**٢٥٢ - عبدالله بن الإمام أحمد** وتی : باوکم وتی : وکیع فەرموودەی (إسرائیل عن أبي إسحاق عن عبدالله بن خلیفة عن عمر رضي الله عنه : (کاتێک پەروەردگار تبارک و تعالی لەسەر کورسی دائەنیشێت، دەنگێک ئەبیسترێت وەکو دەنگی سواریەکی نوێ) بۆ گێڕاینەوە .

پیاوێک پێی سەغڵەت بوو، باوکم ناوی کەسەکەی هێنا، جا وکیع تووڕە بوو و وتی : (گەیشتین بە الأعمش و سفیان ئەم فەرموودانەیان ئەگێڕایەوە و ڕەتیان نەئەکردەوە) .

**٢٥٣ - إبن عباس** رضي الله عنهما فەرمووی : (کورسی جێگای پێیەکانە - **واته هی الله تعالی** - وە عەرش کەس گەورەییەکەی نازانێت) .

**٢٥٤ - إبن عباس** رضي الله عنهما فەرمووی : (بەڕاستی ئەو کورسیەی ئاسمانەکان و زەوی گرتووەتەوە شوێنی پێیەکانیەتی - **الله عز وجل** - ، وە هیچ کەسێک گەورەیی عەرش نازانێت ئیللا ئەوە نەبێت کە دروستی کردووە، وە بەڕاستی ئاسمانەکان لەناو درووستکراوەکانی الرحمن جل وعز بە وێنەی گومەزێکە لە بیابانێکدا) .

٢٥٥ - الضحاك ده‌رباره‌ی فه‌رمایشتی الله عز وجل : | مَا يَكُونُ مِنْ نَجْوَى ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ | (المجادلة : ٧)

وتی : (ئه‌و - الله تعالى - له‌سه‌ر عه‌رشه‌ وه‌ عیلمه‌كه‌ی له‌گه‌ڵیانه‌) .

٢٥٦ - أحمد بن سعيد الدارمي وتی : (گوێم له‌ باوكم بوو وتی : گوێم له‌ أبا عصمة بوو پیاوێك پرسیاری لێكرد ده‌رباره‌ی ئایا الله عز وجل، له‌ ئاسمانه‌ ؟

جا فه‌رمووده‌كه‌ی پێغه‌مبه‌ر ﷺی بۆ گێڕایه‌وه‌ ئه‌و كاته‌ی پرسیار ئه‌كات له‌ كه‌نیزه‌كه‌كه‌ : الله له‌ كوێیه‌ ؟

وتی : له‌ ئاسمانه‌ .

فه‌رمووی ﷺ : من كێم ؟

وتی : رسول الله .

فه‌رمووی ﷺ : ئازادی بكه‌ن چونكه‌ ئه‌وه‌ ئیمانداره‌ .

وتی : رسول الله ﷺ ناوی لێنا : ئیماندار كه‌ زانی الله تعالى له‌ ئاسمانه‌) .

---

: ئه‌و كه‌نیزه‌كه‌ له‌لای رسول الله ﷺ ئیمانداره‌، وه‌ له‌لای ئه‌شعه‌ریه‌ جه‌همیه‌كان كافره‌ .

٢٥٧ - معدان وتی : (پرسیارم کرد له سفيان الثوري دەربارەی وتەی الله عز وجل : | وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنْتُمْ | (الحديد : ٤) .

وتی : عیلمەکەی ) .

٢٥٨ - علی بن حسن وتی : (پرسیارم کرد له عبدالله بن المبارك چۆن پێویسته پەروەردگارمان عز وجل بناسین ؟

وتی : له سەرووی ئاسمانی حەوتەم لەسەر عەرشەکەی ، ئەوە ناڵێین وەک چۆن جەهەمیەکان ئەیڵێن الله ئا لێرەیە له زەویدایە ) .

---

- إبن عباس پرسیاری له رسول الله ﷺ کرد دەربارەی ئایەتی : | وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ | (البقرة : ٢٥٥) .

**فەرمووی : (کورسیەکەی جێگەی پێ یەتی ، وە عەرشیش گەورەییەکەی ناتوانرێت دیاریبکرێت ) .**

**الرد على الجهمية لإبن مندة**

**- إبن عباس رضي الله عنهما فەرمووی : (کورسی جێی دوو پێ یەکانە - واتە دوو پێی الله تعالى - ، وە عەرش کەس ناتوانێت گەورەییەکەی دیاری بکات ) .**

**التفسير عبدالرزاق ، والتوحيد لإبن خزيمة**

**- إبن عباس رضي الله عنهما فەرمووی : (کورسی جێی دوو پێیەکانیەتی ) .**

**تفسير إبن أبي حاتم**

- مسلم البطين وتی : (کورسی جێی دوو پێ یەکانە - واتە دوو پێی الله تعالى - ) .

## تفسير الطبري

- يحيي بن معين وتی، لەگەڵ زکريا بن عدي دا بووم پرسیاری لە وكيع بن الجراح کرد وتی : ئەی باوکی سوفیان، چی ئەڵێیت لەبارەی ئەم فەرموودەیانە؟ واتە وەکو فەرموودەی (کورسی جێی دوو پێ یەکانە) وە فەرموودەی لەم جۆرە؟

وكيع وتی : (گەیشتین بە إسماعيل بن أبي خالد، وە سفيان الثوري، وە مسعر ئەم فەرموودەیانەیان ئەگێڕایەوە و هیچ تەفسیرێکیان بۆی نەئەکرد) .

## تأريخ يحيي بن معين

: دەستەواژەی (هیچ تەفسیرێکیان بۆی نەئەکرد) واتە واتای فەرموودەکە زۆر ڕوونە، هیچ پێویست بە تەفسیرکردن ناکات، بۆ نمونە کەسێک بە تۆ ئەڵێت (نیوەڕۆ سەعات ١٢ نان بخۆ) ئەمە هیچ پێویست ئەکات تەفسیری بۆ بکەیت؟ بێگومان نەخێر، لێرەش فەرموودەکە ئەڵێت کە کورسی جێی دوو پێیەکانی الله تعالى یە، واتاکەی زۆر ڕوونە، وە مانایەکی تری واتا ئەو تەحریفانەیان بۆ نەئەکرد کە جەهمیەکان بۆیان ئەکرد، والله أعلم .

## باب : (١١)

## پرسیاری لێ کرا دەربارەی ئیمان و ڕەددانەوەی مورجیئەکان



(لەلای سەلەف رحمهم الله ئیمان وتە و کردەوەیە و زیاد و کەم ئەکات، لەلای مورجیئە گومڕاکانیش ئیمان تەنها وتەیە و کردەوەی لاشە ناگرێتەوە، وە ئیمان لەلایان زیاد و کەم ناکات، چونکە ئیمان تەنها وتەیە لەلایان، وە وتەش یەکجار ئەیلێیت و تەواو .

لەلای مورجیئە گومڕاکانی نوێژکردن و ڕۆژووگرتن و جیهادکردن و تەواوی کار و کردەوە باشەکان ئیمان زیاد ناکەن .

وە زیناکردن و قسەی خراپ و دزیکردن و عەرەق خواردنەوە و تەواوی خراپەکان ئیمان کەم ناکەن .

جا ئەم عەقیدەی بۆگەنە پێچەوانەی چەندین ئایەت و فەرموودەیە، وە سەلەف رحمهم الله لە کتێبەکانیدا بۆ ڕەددی مورجیئەکان ئەو ئایەت و فەرموودەیانە بە بەڵگە ئەهێننەوە کە باسی ئەوە ئەکات کردەوە بەشێکە لە ئیمان، یان کردەوە یەکێکە لە هۆکارەکانی زیادبوون یان کەمبوونی ئیمان) .



٢٥٩ - گوێم لە باوكم بوو رحمه الله پرسیاری لێكرا دەربارەی ئیرجاء ؟

وتی : (ئێمە ئەڵێین ئیمان وتە و كردەوەیە، زیاد ئەكات و كەم ئەكات، كاتێك زینای كردوو و سەرخۆشكەری خواردەوە ئیمانی كەم ئەكات ) .

٢٦٠ - أبو نعیم وتی : گوێبیستی سفیان بووم، واتە : الثوري بوو وتی : (ئیمان زیاد ئەكات و كەم ئەكات ) .

٢٦١ - فضیل بن عیاض وتی :

(ئەهلی ئیرجاء ئەڵێن : ئیمان وتەیە بەبێ كردەوە .

وە جەهمیەكان ئەڵێن : ئیمان ناسینە بەبێ وتە و بەبێ كردەوە .

وە ئەهلی سوننەش ئەڵێن : ئیمان ناسینە، وە وتەیە، وە كردەوەیە ) .

٢٦٢ - وكیع وتی : ئیمان زیاد ئەكات و كەم ئەكات، وە سفیان یش بە هەمان شێوەی ئەوت ) .

٢٦٣ - سفیان الثوري وتی : (خەڵكی ئیماندارن لە لامان لە أحكام و میراتدا، وە ئومێدەوارین كە وابن، بەڵام نازانین حاڵمان چۆنە لە لای الله عز وجل ) .

٢٦٤ - عبد الله بن نمير وتی : (گوێم لە سفیان بوو وە باسی مورجیئە کرا، وتی : ڕا و بۆچوونێکی داهێنراوە، گەیشتین بە خەڵكی لەسەر بێجگە لەوە بوون).

٢٦٥ - مجاهد وتی : (ئیمان زیاد ئەكات و كەم ئەكات، وە ئیمان وتە و كردەوەیە) .

٢٦٦ - إبراهيم النخعي وتی : (فیتنەی مورجیئە ترسناكترە لەسەر ئەم ئوممەتە لە فیتنەی ئەزاریقەكان) .

: ئەزاریقەكان یەكێكن لە خراپترین جۆرەكانی خەواریج .

٢٦٧ - إبراهيم النخعي وتی : (مورجیئە وایان لەم دینە كرد تەنكتر بێت لە پۆشاكی سابري - قوماشێكی زۆر تەنكە - ) .

٢٦٨ - عمير بن حبيب رضي الله عنه فەرمووی : (بەڕاستی ئیمان زیاد و كەم ئەكات .

پێی وترا : زیادبوونەكەی چیە، وە كەم بوونەكەی چیە ؟

فه‌رمووی : كاتێك زیكری الله عز وجل مان كردوو و لێی ترساین، ئه‌وه زیاد بوونه‌كه‌یه‌تی، وه كاتێك بێ ئاگابووین لێی و له‌بیرمان كرد ئه‌وه كه‌مبوونه‌كه‌یه‌تی ) .

٢٦٩ - طاوس بن كيسان وتی : (نمونه‌ی ئیمان وه‌كو داره : بنچینه‌كه‌ی شه‌هاده‌یه، وه قه‌ده‌كه‌ی و گه‌ڵاكه‌ی به‌م شێوه‌یه‌یه، وه به‌رهه‌مه‌كه‌ی : وه‌رع ه، وه هیچ خێرێك له دارێكدا نییه كه به‌رهه‌می نه‌بێت، وه هیچ خێرێكیش له ئینسانێكدا نیه كه وه‌رعی نه‌بێت ) .

---

: وه‌رِع واته دوور كه‌وتنه‌وه له‌و شتانه‌ی كه گومان و شووبووهاتیان له‌سه‌ره له ترسی ئه‌وه‌ی كه نه‌كه‌ویته ناو حه‌رامه‌وه .

٢٧٠ - مالك بن أنس وتی : (ئیمان وته و كرده‌وه‌یه، زیاد و كه‌م ئه‌كات).

٢٧١ - عبدالله بن أحمد بن حنبل وتی : باوكم بۆی باسكردم وتی : (پێم گه‌یشتووه كه مالك كوڕی أنس و إبن جريج و شريك و فضيل بن عياض وتوویانه : ئیمان وته و كرده‌وه‌یه ) .

٢٧٢ - عبيد بن عمير الليثي وتی : (ئیمان به هیوا خواستن نییه، به‌ڵكو ئیمان وته‌یه‌كه كه مانای هه‌یه، وه كرده‌وه‌یه‌كه جێبه‌جێ ئه‌كرێت ) .

٢٧٣ - **الأوزاعي** ئەڵێت : (یحیی و قتادة ئەیانوت : هیچ شتێك نییە لە هەوا و ئارەزووەكان ترسناكتر بێت لە ئیرجاء لەلایان لەسەر ئەم ئوممەتە) .

٢٧٤ - **محمد بن سيرين** وتی : (كاتێك پێت وترا تۆ ئیمانداری ؟

بڵێ : ﴿ **آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنْزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ** ﴾ .

٢٧٥ - **محل** وتی : (إبراهيم پێی وتم : كاتێك پێت وترا تۆ ئیمانداری ؟ بڵێ : ئیمانم هێناوە بە الله و فریشتەكانی و كتێبەكانی و پێغەمبەرەكانی) .

٢٧٦ - **إبراهيم النخعي** وتی : (پرسیار كردنی پیاوێك لە پیاوێك : تۆ ئیمانداری ؟ بیدعەیە) .

٢٧٧ - **أيوب السختياني** وتی : (سعيد بن جبير پێی وتم : من تۆم بینی لەگەڵ طلق ؟!

وتم : بەڵێ، چی هەیە ؟

وتی : لەگەڵی دامەنیشە چونكە ئەوە مورجیئەیە .

أيوب وتی : پرسیارم لێ نەكردبوو دەربارەی، بەڵام حەقە بۆ موسڵمان كاتێك شتێكی بینی لە براكەی كە ناشرینە، فەرمانی پێبكات و ڕێگری لێبكات) .

**٢٧٨ - عبد الله بن حبيب**، له دایكیه‌وه كه وتی : (گوێم له سعيد بن جبير بوو وه باسی مورجیئه كرا، وتی : جووله‌كه‌ن) .

**٢٧٩ - العلاء بن عبد الله بن رافع** وتی : ذر أبا عمر، هات بۆ لای سعيد بن جبير بۆ پێویستیه‌ك، وتی : (نه‌خێر، هه‌تا هه‌واڵم پێنه‌ده‌یت ئه‌مڕۆ له‌سه‌ر چ دینێكیت ؟ یان : ئه‌مڕۆ تۆ له‌سه‌ر چی ڕاو و بۆچوونێكیت ؟ تۆ تا ئێستاش به دوای دینێكدا ئه‌گه‌ڕێیت كه ونت كردووه، ئایا شه‌رم ناكه‌ی له ڕاو و بۆچوونێك كه تۆ گه‌وره‌تری له لێی ؟) .

---

: ذر مورجیئه بووه .

**٢٨٠ - أبي المختار** وتی : (ذر سكاڵای له سعيد بن جبير كرد له لای أبي البختري الطائي پێی وت : تێپه‌ڕیم به لایدا سه‌لامم لێكرد جوابی نه‌دامه‌وه!!

جا أبو البختري به سعيد بن جبير .وت .

جا سعيد وتی : به‌ڕاستی ئه‌مه هه‌موو ڕۆژێك دینه‌كه‌ی تازه ده‌كاته‌وه، نه‌خێر والله هه‌رگیز هیچ قسه‌یه‌كی له‌گه‌ڵ ناكه‌م) .

**٢٨١ - رسول الله ﷺ** فه‌رمووی : (هه‌ر كه‌سێك خراپه‌كه‌ی دڵ ته‌نگی كرد، وه چاكه‌كه‌ی خۆشحاڵی كرد، ئه‌وه ئیمانداره) .

٢٨٢ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئیمان حەفتا و ئەوەندە باب ە، بەرزترینیان : لا اله الا الله یە، وە نزمترینیان : لابردنی ئازارە لەسەر ڕێگا، وە شەرمیش بەشێكە لە ئیمان).

٢٨٣ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (شەرمكردن بەشێكە لە ئیمان).

٢٨٤ - ذر الهمداني هات بۆ لای سعيد بن جبير بۆ پێویستیەك، جا وتی : (نەخێر، هەتا هەواڵم پێنەدەیت ئەمڕۆ تۆ لەسەر چ دینێكیت؟! ئایا شەرم ناكەیت لە دینێك تۆ گەورەتری لە ئەو).

---

واتە : تەمەنی تۆ زیاترە لە تەمەنی ئەو بیدعەیەی كە داتهێناوە و كردووتە بە دین.

٢٨٥ - عبدالرحمن بن مهدی وتی : پێمگەیشتووە كە شعبة بە شريك ی وتووە : چۆن شایەتی مورجیئە بە دروست نازانیت؟

وتی : (چۆن شایەتی قەومێك بە دروست ئەزانم كە وا گومان ئەبەن كە نوێژ لە ئیمان نیە!!).

٢٨٦ - جرير بن عبدالحميد وتی : (ئیمان وتە و كردەوەیە).

وە الأعمش و منصور و مغيرة و ليث و عطاء بن السائب و إسماعيل بن أبي خالد و عمارة بن القعقاع و العلاء بن المسيب و ابن شبرمة و سفيان الثورى

و أبو يحيى هاوەڵی الحسن و حمزة الزيات، ئەيانوت : ئێمە ئيمانداررين إن شاء الله، وە ئەو كەسەيان عەيبدار ئەكرد كە إستثناء ی نەدەكرد .

٢٨٧ - خالد بن الحارث وتی : (ئيمان وتە و كردەوەيە، زياد ئەكات و كەم ئەكات ).

٢٨٨ - على بن الحسن بن شقيق وتی : (پياوێك بە عبدالله بن المبارك ی وت : ئەی كۆمەڵەی مورجيئەكان .

فەرمووی : تۆمەتبارت كردم بە هەوا و ئارەزوويەك لە هەوا وئارەزووەكان).

٢٨٩ - يحيى بن سليم وتی : (مالك بن أنس پێی وتم : ئيمان وتە و كردەوەيە .

وە محمد بن مسلم الطائفي وتی : وتە دروست نييە ئيللا بە كردەوە نەبێت .

وە فضيل بن عياض پێی وتم : وتە دروست نييە ئيللا بە كردەوە نەبێت.

وە ابن جريج پێی وتم : ئيمان وتە و كردەوەيە ) .

٢٩٠ - إبراهيم النخعي وتی : (لەلای من خەواريجەكان عوزريان زياترە لە مورجيئەكان ) .

**٢٩١** - جعفر الأحمر ئەڵێت : **منصور بن المعتمر** دەربارەی شتێك وتی : (ئەوە ناڵێم وەكو ئەوەی مورجیئە گومڕا و موبتەدیعەكان وتیان) .

**٢٩٢** - إبن نمير وتی : گوێم لە **سفيان** بوو وە باسی مورجیئە كرا وتی : (ڕاو بۆچوونێكی داهێنراوە، گەیشتین بە خەڵكی لەسەر بێجگە لە ئەمە بوون) .

**٢٩٣** - لوين وتی : وترا بە **سفيان بن عيينة** : پیاوێك ئەڵێت تۆ ئیمانداری ؟

وتی : گومانم نیە لە ئیمانم، وە پرسیار كردنەكەت لە من بیدعەیە، وە نازانم من لەلای الله عزوجل بەدبەختم، یان كردەوەكانم قبوڵكراوە یان نا) .

**٢٩٤** - أبی حمزة وتی : پیاوێك پرسیاری كرد لە **إبراهيم النخعي** ئایا تۆ ئیمانداری ؟

وتی : (گومانم نیە لە ئیمانم، وە پرسیارەكەی تۆ لە من دەربارەی ئەمە بیدعەیە) .

**٢٩٥** - يحيى بن سليم وتی : پرسیارم كرد لە **هشام بن حسان** كە الحسن چی ئەوت دەربارەی ئیمان ؟

وتی : (الحسن ئەیوت : ئیمان وتە و كردارە .

یحیی وتی : محمد بن عبدالله بن عمرو بن عثمان بن عفان وتی : وتە دروست نییە ئیللا بە كردەوە نەبێت) .

---

: (وتە دروست نییە ئیللا بە کردەوە نەبێت) واتە وتە هیچ سوودێکی نییە ئەگەر کار و کردەوەی لەگەڵدا نەبێت .

٢٩٦ - إبراهيم وتی : پیاوێك بە علقمة ی وت : ئایا تۆ ئیمانداری ؟

وتی : (ئومێدوارم) .

٢٩٧ - سعيد بن جبير وتی : (مورجیئەکان جوولەکەی قیبلەن) .

٢٩٨ - عبدالرزاق وتی : معمر و إبن جريج و الثوري و مالك و إبن عيينة ئەیانوت : (ئیمان وتە و کردەوەیە زیاد ئەکات و کەم ئەکات)، وە منیش ئەوە ئەڵێم : (ئیمان وتە و کردەوەیە، وە ئیمان زیاد ئەکات و کەم ئەکات، جا ئەگەر پێچەوانەیان بکەم ئەوکات من گومڕا بووم و یەکێك نیم لە هیدایەتدراوان) .

---

: نەک تەنها لەم بابەتەدا، بەڵکو لە هەموو بابەتە عەقیدەییەکاندا هەر کەسێک لە ژێر هەر ناوێکدا موخالەفەی ئەو ئیمامانە بکات گومڕا و گومڕاکەرە بەلایەنی کەمەوە .

٢٩٩ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (نێوان بەندە و شیرك ، وازهێنانە لە نوێژ، جا ئەگەر وازی لێهێنا ئەوە شیرکی کردووە) .

٣٠٠ - **الأوزاعي** وتی : يحيى بن أبي كثير و قتادة ئەيانوت : (هيچ شتێك نييە لە هەوا و ئارەزووەكان ترسناكتر بێت لە لايان لەسەر ئەم ئوممەتە لە ئيرجاء) .

٣٠١ - محمد بن سليمان لوين وتی : وترا بە **سفيان** : پياوێك ئەڵێت تۆ ئيمانداری ؟

وتی : (گومانم نيە لە ئيمانم، وە پرسيار كردنەكەت لە من بيدعەيە، وە نازانم من لەلای الله عزوجل بەدبەختم يان نا ؟ وە كردەوەكانم قبوڵكراوە يان نا ؟) .

٣٠٢ - **الوليد بن مسلم** وتی : (گوێم لە أبا عمرو و مالك بن أنس و سعيد بن عبدالعزيز بوو، ئينكاری ئەوەيان ئەكرد كە بوترێت : من ئيماندارم، وە رێگەيان ئەدا بە الإستثناء كە بوترێت : من ئيماندارم إن شاء الله) .

٣٠٣ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (**تەواوترينی ئيمانی ئيمانداران ئەو كەسەيە كە جوانترين ڕەوشتی هەيە**) .

٣٠٤ - **عبد الرحمن بن عصمة** وتی : (من لە لای عائشة بووم رضی الله عنها، نێردراوی معاوية رضی الله عنه هات بە دياريەكەوە وتی : ئەميری ئيمانداران بۆ تۆی ناردووە .

فەرمووی : ئێوە ئیماندارانن إن شاء الله تعالی، وە ئەو ئەمیرتانە، وە ئەوە دیاریەکەیم قبوڵ کرد).

٣٠٥ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (سێ شت هەن هەر کەس خاوەنی بێت شیرینی ئیمان ئەچێژێت : الله عز وجل و پێغەمبەرەکەی خۆشەویستر بێت لە لای لە هەموو شتێکی تر، وە ئەگەر کەسێکی خۆشویست، خۆشی نەوێت تەنها لەبەر الله نەبێت، وە پێی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ کوفر لە دوای ئەوەی الله عز وجل ڕزگاری کرد لێی، وەك چۆن پێی ناخۆشە کە ئاگرێکی بۆ هەڵبگیرسێنرێت و فڕێبدرێتە ناویەوە).

٣٠٦ - أبي سعيد الخدري رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (ئێوە کردەوەگەلێک ئەنجام ئەدەن کە بچوکترە لەبەر چاوتان لە تاڵە موویەك، ئێمە لە سەردەمی رسول الله ﷺ لە ڕیزی تاوانە لەناوبەرەکان هەژمارمان ئەکرد) .

٣٠٧ - صلة بن زفر و سليك بن مسحل وتیان : (حذيفة هات بۆ لامان و ئێمە قسەمان ئەکرد، جا فەرمووی : ئێوە قسەیانێك ئەکەن ئێمە لە سەردەمی رسول الله ﷺ حسابی دووڕوویمان بۆ ئەکرد).

٣٠٨ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (گرێ کانی ئیسلام گرێ بە گرێ هەڵئەوەشێتەوە، جا هەر کاتێك گرێیەك هەڵوەشایەوە خەڵکی دەست ئەگرن بەوەی دوایەوە، جا یەکەمیان کە هەڵئەوەشێتەوە حوکمە، وە ئاخیرەمیان نوێژە).

**٣٠٩** - **عمر بن عبد العزيز** وتی: (رسول الله ﷺ و كاربەدەستانی دوای ئەو سوننەتیان دانا، دەست گرتن پێیانەوە بەڕاستخستنەوەی كتێبی الله یە عز وجل، وە لە تەواوییێتی گوێڕایەڵی الله یە، وە هێزە لەسەر دینی الله عز وجل، هەر كەسێك كاری پێبكات هیدایەت دراوە، وە هەر كەسێك سەریبخات سەركەوتووە، وە هەر كەسێك پێچەوانەی بكات شوێن غەیری ڕێگەی ئیمانداران كەوتووە، وە الله عز وجل ڕووی وەرئەگێرێت بۆ ئەوەی ڕووی تێكردووە).

---

**: ئەم وتە ئاڵتوونیەی عمر بن عبدالعزیز رحمه الله تعالى بكە بە یاسایەک بۆ خۆت و بەباشی بیری لێ بكەرەوە و لێی ڕابمێنە .**

**٣١٠** - **رسول الله ﷺ** فەرمووی: (نێوان بەندە و كوفر وازهێنانە لە نوێژ).

**٣١١** - **رسول الله ﷺ** فەرمووی: (نێوان ئێمە و نێوان ئەوان - **واتە كافر و موشریكەكان** - وازهێنانە لە نوێژ، جا هەر كەسێك وازی لێبهێنێت ئەوە كافر بووە).

**٣١٢** - **القاسم بن مخيرمة** وتی: (نوێژەكانیان لە كاتی خۆیدا نەكرد و وازیان لێنەهێنا، ئەگەر بێتو وازیان لێبهێنایە ئەوا بە وازهێنان لێی كافر ئەبوون).

٣١٣ - عبد الله بن مسعود رضي الله عنه فەرمووی : (ئەوەی نوێژ نەكات دینی نییە) .

٣١٤ - سعيد بن جبير وتی : (پشت بەستن بە الله عز وجل كۆكەرەوەی ئیمانە) .

٣١٥ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەو ئیماندارەی تەواوترین ئیمانی هەیە كەسێكە كە جوانترین ڕەوشتی هەیە ، وە نەرمونیانترینە لەگەڵ خێزانەكەیدا) .

٣١٦ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (هەر كەسێك پارێزگاریان لێبكات ئەوا بۆی ئەبێت بە ڕووناكی و بەڵگە و ڕزگار بوون لە ڕۆژی قیامەت ، وە هەر كەسێك پارێزگاریان لێ نەكات نە ڕووناكی و نە بەڵگە و نە ڕزگاربوونی هەیە ، وە لە ڕۆژی قیامەتیشدا لەگەڵ قارون و فیرعەون و هامان و أُبي بن خلف دایە) .

٣١٧ - أبا بكر الصديق رضي الله عنه فەرمووی : (خۆتان بپارێزن لە درۆكردن چونكە درۆ دووركەرەوەی ئیمانە) .

٣١٨ - میمون وتی : (إبراهيم النخعي پێی وتم : مەهێڵن ئەم بەلەعنەت بووە بێتە ژوورەوە بۆ لام لە دوای ئەوەی قسەی كرد كە ئیرجائدا) واتە : حماد .

---

: مەبەستی حماد بن أبي سليمان ی مورجیئەی گومڕایە ، شێخی ئەبو حەنیفە .

٣١٩ - عبد الله رضي الله عنه فەرمووی : (ڕیبا حەفتا و ئەوەندە بەشە، وە شیرك یش بە هەمان شێوەیە) .

٣٢٠ - هشام بن عروة وتی : (ئەمانەتی هیچ بەندەیەك كەم ناكات، ئیللا ئیمانەكەشی كەم ئەكات) .

٣٢١ - إبن مسعود رضي الله عنه لە دوعاكانیدا ئەیفەرموو : (ئەی پەروەردگارم ئیمان و یەقین و تێگەیشتنمان زیاد بكەیت) .

٣٢٢ - سعيد بن جبير لە تەفسیری ئایەتی : ﴿وَلَكِن لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي﴾ (البقرة : ٢٦٠) .

وتی : (بۆ ئەوەی ئیمانم زیاد بكات) .

٣٢٣ - جندب رضي الله عنه فەرمووی : (ئێمە لەگەڵ رسول الله ﷺ گەنجانێك بووین تازە پێئەگەشتین، فێری ئیمان بووین پاشان فێری قورئان بووین جا ئیمانمان پێی زیادی كرد) .

٣٢٤ - أبي ليلى الكندي وتی : حجر بن عدي كوڕەكەی بینی كەم تەرخەم بوو لە دەستنوێژ گرتندا .

جا فەرمووی : ئەو پەڕاوە بێنە، ئەمە ئەوەیە كە علي رضي الله عنه بۆی باسكردین : (دەست نوێژ نیوەی ئیمانە) .

٣٢٥ - علي رضي الله عنه وتی : (پاك و خاوێنی نیوەی ئیمانە) .

٣٢٦ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (هەر كەسێك پێی خۆشە هەست بە تامی ئیمان بكات، با هەر كەسێكی خۆش ویست، خۆشی نەوێت ئیللا لەبەر الله عز وجل نەبێت) .

٣٢٧ - أبي یحیی دەڵێت : پرسیار كرا لە حذیفة رضي الله عنه موونافیق كێیە ؟

فەرمووی : (ئەوەیە كە وەسفی ئیسلام ئەكات و كاری پێناكات) .

: واتە بە دەم هیچی نەهێشتووەتەوە بەڵام كار و كردەوەی پێ ناكات .

٣٢٨ - عبد الله بن مسعود رضي الله عنه فەرمووی : (وازهێنەر لە زەكات موسڵمان نییە) .

٣٢٩ - عبد الله بن مسعود رضي الله عنه فەرمووی : (ئارامگرتن نیوەی ئیمانە، وە یەقینیش هەموو ئیمانە) .

٣٣٠ - فضیل بن عیاض وتی : (هاوەڵانی ڕا و بۆچوون ووتیان : نە نوێژ و نە زەكات و نە هیچ شتێك لە فەرزەكان لە ئیمان نیە، ئەمەش بوختانە بۆ الله عز

وجل، پێچەوانەی قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، ئەگەر ئەم وتە وابووایە وەکوو ئەوەی ئەوان دەیڵێن أبو بكر رضي الله عنه شەڕی لەگەڵ ئەهلی ڕیدەدا نەئەکرد).

---

: بەشێکی ئەهلی ڕیدە ئەوانە بوون کە وتیان زەکات نادەین أبو بكر رضي الله عنه تەکفیری کردن و شەڕی لەگەڵ کردن.

**٣٣١** - **فضيل بن عياض** وتی : (بنچینە و بەشەکانی ئیمان لای ئێمە دوای شایەتیدان و تەوحید، وە دوای شاهێدی دان بۆ پێغەمبەر ﷺ بە گەیاندنی - **دینەکەی** - ، وە دوای جێبەجێ کردنی فەڕزەکان : ڕاستگۆییە لە قسەدا، وە پاراستنی ئەمانەتە، وە وازهێنانە لە خیانەت، وە وەفادارییە بە پەیمان، وە گەیاندنی سیلەی ڕەحمە، وە دڵسۆزیە بۆ هەموو موسوڵمانان، وە ڕەحمەتە بۆ هەموو خەڵکی).

پێیان وت واتە بە فضيل : ئەمە ڕای تۆیە کە وتت، یان بیستووتە ؟

فەرمووی : (بەڵکو گوێمان لێی بووە و فێری بووین، وە ئەگەر وەرم نەگرتبێت لە ئەهلی فیقهـ و چاکە ئەوە باسم نەئەکرد).

- فضيل وتی : (مورجیئەکان ئەڵێن : ئیمان وتەیە بەبێ کردەوە !

وە جەهمیەکان ئەڵێن : ئیمان ناسینە، بەبێ وتە، وە بەبێ کردەوە !

وە ئەهلی سوننە ئەڵێن : ئیمان ناسینە، وە وتەیە، وە كردەوەیە بە جەستە.

جا هەر كەسێك بڵێت : ئیمان وتە و كردەوەیە، ئەوە وەری گرتووە بە بەڵگەوە .

وە هەر كەسێك بڵێت : ئیمان وتەیە بەبێ كردەوە، ئەوە لە مەترسیدایە، لەبەر ئەوەی نازانێت ئایا دانپێدنانەكەی لێ قبووڵ ئەكرێت ئەدرێتەوە بەناوچاویدا بەهۆی گوناهەكانیەوە .

وە وتی : ئەوە بۆم ڕوون كردوویەتەوە، مەگەر كوێر بێت !

**٣٣٢** - **مجاهد** دەربارەی وتەی الله عز وجل : ﴿ **وَمَنْ يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا** ﴾ (البقرة : ٢٦٩) .

فەرمووی : (تێگەیشتن و زانستە) .

**٣٣٣** - **عمر بن خطاب** رضي الله عنه فەرمووی : (ئەگەر بێتو ئیمانی أبو بكر بە ئیمانی هەموو خەڵكی سەر زەوی بكێشیت ئەوا قورستر ئەبوو) .

## باب : (١٢)

## پرسیاری لێكرا دەربارەی قەدەریەكان و نوێژكردن لە پشتیانەوە و ئەوەی هاتووە دەربارەیان



(باوەڕبوون بە قەدەر یەكێكە لە شەش پایەكەی ئیمان، وە تەوحید و ئیسلامی هیچ كەسێک دانامەزرێت بە ڕەتكردنەوەی یان بەدرۆخستنەوەی یەكێک لەو شەش پایەیە، قەدەریەكان لەپاش خەواریجەكان و شیعەكان سێیەم كۆمەڵەی لادەربوون كە دروست بوون، وە سەرەتای ئەم فیتنەیەش لە كەسێكی زندیقەوە دەستی پێكرد كە سەرەتا نەسرانی بوو پاشان موسوڵمان بوو ئینجا مورتەد بوویەوە، دواتر معبد لێی وەرگرت دواتر غیلان یش لەوی وەرگرت.

- الأوزاعي ئەڵێت : (یەكەم كەس كە لە قەدەر دا قسەی كرد كابرایەكی عێراقی بوو پێی ئەوترا (سوسن)، نەسرانی بوو، پاشان موسوڵمان بوو، پاشان بوویەوە بە نەسرانی، معبد الجهني عەقیدەكەی لێ وەرگرت، پاشان غیلان یش لە معبد ی وەرگرت ) .

**كتاب القدر لـ الفريابي : ٣٤٨**

- الآجري ئەڵێت : (ئەگەر كەسێک وتی : ئیمامی قەدەریەكان كامانەن لە مەزهەبەكانیاندا ؟

پێی ئەوترێت : الله تعالى موسوڵمانانی بەرزڕاگرتووە لە مەزهەبەکانیان - واتە لە عەقیدەکەیان - ، وە ئیمامی قەدەریەکان لە مەزهەبەکانیاندا : معبد الجهني لە بەسرە، وە هاوەڵان و تابیعین ڕەددیان دایەوە وەک چۆن پێشتر باسمان کرد، وە پێشتر پیاوێکی ئەهلی عێراق هەبوو نەسرانی بوو، موسوڵمان بوو پاشان بوویەوە بە نەسرانی، جا معبد الجهني - عەقیدەکەی - لەوەوە وەرگرت، الأوزاعي رحمه الله وای وت، وە غیلان لە معبد ی وەرگرت، وە پێشتر باسی بەسەرهاتی غیلان مان کرد، وە باسی ئەو سەرشۆڕی و ڕسوابوونەیمان کرد کە الله لە دنیادا بۆی پێشخست، وە ئەوەی لە قیامەتدا چاوەڕێی ئەکات گەورەترە، وە باسی عمرو بن عبید و زەمکردنی ئیمامەکان بۆی و هەجر و تەکفیرکردنیمان کرد، ئەوانە ئیمامە پیس و قێزەونەکانیانن ) .

**الشريعة : ٦٤٢**

- الهروي ئەڵێت : (وە فیتنەی قەدەر یەکەم کەس معبد الجهني باسی کرد، کەسێک بوو لە ئەهلی بەسرە، شتێک لە زانستی پێی بوو، پێیان ئەوت معبد بن خالد، وە ئەو کەسەیە کە عبدالله بن عمر بن الخطاب خۆی لێ بەری کرد، وە غیلان شتێک لە زانستی پێ بوو، لەکاتی خەلافەتی عبدالملک بن مروان قسەی کرد - واتە لە قەدەردا - ، وە عمر بن عبدالعزیز تۆبەی پێ کرد، پاشان دەرکەوت کە تۆبەکەی درۆینە بووە، جا لەبەر ئەوەی لە خاچ درا بە زەلیلترین شێوە کە مرۆڤ تووشی ببێت لەسەر دەرگای شام، وە عمرو بن عبید یەکەم کەس بوو بناغەی بۆ دانا - واتا یاسا و قاعیدەی بۆ عەقیدەی قەدەریەکان دانا - ، وە بوو بە پێشەوایان و بانگەوازی بۆ ئەکرد، وە ئیمامی الکلام - بەناو عیلمی کەلام کە هەموو موتەکەلیمینی تووشی کوفر کردووە - بوو، وە بانگەوازکاری یەکەمی زەندەقە و سەرگەورەی موعتەزیلەکانە، وە ئیمامی مالک لەعنەتی لێ کردووە، جا الله عز

وجل شمشێرێک له شمشێره‌کانی ئیسلامی زاڵ کرد به‌سه‌ریدا، ئه‌ویش أيوب السختياني - **ته‌له‌به‌ی حسن البصري** - بوو، جا نهێنیه‌کانی هه‌ڵماڵی و عه‌یبه‌کانی ده‌رخست و زۆر له‌عنه‌تی لێ ئه‌کرد، ئه‌مه‌ش به‌سه‌رهاتی ئه‌هلی به‌سرە، وه به‌سه‌رهاتی غيلان، له شام به‌ڵا و خراپه‌که‌ی ده‌رکه‌وت، جا الله ڕه‌یحانه‌که‌ی ئه‌هلی شام أبو عمرو الأوزاعي زاڵ کرد به‌سه‌رياندا) .

**ذم الكلام**

- إبن بطة له درێژه‌ی باسکردنی ئیمامه‌کانی کوفر دا ئه‌ڵێت :

(له سه‌رانی قه‌ده‌ریه‌کان : معبد الجهني، و غيلان القدري، و ثمامة بن الأشرس، و عمرو بن عبيد، و ابو الهذيل العلاف، و ابراهيم النظام، و بشر بن المعتمر له کۆمه‌ڵه‌یه‌کدا که هه‌موویان ئه‌هلی کوفر و گومڕایین) .

**الإبانة الصغرى : ٥٥٠**

ئه‌مه باسی چۆنیه‌تی سه‌رهه‌ڵدانی قه‌ده‌ریه‌کان بوو، ئێستاش باسی عه‌قیده‌ی سه‌له‌ف ئه‌که‌ین ده‌رباره‌ی قه‌ده‌ر، وه‌ک هه‌موو بابه‌ته‌کانی تر سه‌له‌ف رحمهم الله ته‌سلیمی قورئان و فه‌رمووده بوون به تێگه‌یشتنی زانایانی پێش خۆیان، وه حرب الكرماني به شێوه‌یه‌که‌ی کورت و پوخت باسی عه‌قیده‌ی سه‌له‌ف ئه‌کات له‌وباره‌یه‌وه :

حرب الكرماني ئه‌ڵێت : (قه‌ده‌ر خێر و شه‌ڕی، که‌م و زۆری، رووکه‌ش و په‌نهانی، خۆش و ناخۆشی، ئه‌وه‌ی پێت خۆشه و ئه‌وه‌ی پێت ناخۆشه، باش و خراپی، سه‌ره‌تا و کۆتایی، هه‌مووی له‌لایه‌ن الله تبارك وتعالى يه .

بڕیارێکە داویەتی بەسەر بەندەکانی، وە قەدەرێکە بۆی داناون، هیچ یەکێک لە بەندەکان دەرناچن لە ویستی الله عز وجل و بڕیارەکانی، بەڵکو هەموو بەندەکان بەرەو ئەوە ئەچن کە الله دروستی کردوون بۆی، وە توشی ئەو قەدەرە ئەبن کە الله بۆی داناون هیچ چاریان نیە، ئەمەش عەدلە لەلایەن الله، عز ربنا وجل).

السنة لـ حرب الكرماني

واتە : هەموو شتێکی باش و خراپ کە ڕوو ئەدات یان بەسەر مرۆڤەکاندا دێت قەدەری الله تعالی یە، واتە الله تعالی زانیویەتی کە ئەو شتە ڕووئەدات، پاشان نووسیویەتی کە ڕوویدات، دواتر ویستوویەتی کە ڕوویدات، ئینجا ڕووداو و کردەوەکەی دروست کردووە .

ئەمە مانای وا نییە مرۆڤەکان ویستیان نەبێت، بەڵکو هەموو مرۆڤەکان ویستیان هەیە، بەڵام ویستی الله تعالی لەسەروو ویستیانەوەیە و بەسەریاندا زاڵە، وەک چۆن الله تعالی ئەفەرموویێت : | وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ | (التَّكۡوِير : ٢٩) .

وە لە قیامەتیشدا بەندە لێپێچینەوەی لەگەڵ ئەکرێت لەسەر ئەو ویست و کردەوەیەی کە خۆی بۆ ئەنجامی داوە .

قەدەریەکان چەند جۆرێکن، جۆرێکیان ئەڵێن کە الله تعالی زانیاری نییە بەوەی کە ڕووئەدات هەتا شتەکان خۆیان ڕووئەدەن، بەم شێوەیە سیفەتی زانست و ویستی الله تعالی پەک ئەخەن .

جۆرێکی تریان هەیە ئەڵێن چاکە اللە تعالی دروستی کردووە، وە خراپە اللە تعالی دروستی نەکردووە .

وە جۆرێکی تریان هەیە ئەڵێن اللە تعالی ڕزقی حەلاڵ ئەدات و ڕزقی حەرام نادات، وە کوشتن و زینا و هەموو کارە خراپەکانی تر کە ڕووئەدەن بە ویستی اللە تعالی ڕوونادەن .

جۆرێکی تریان هەن ئەڵێن کار و کردەوەی چاکی بەندەکان اللە تعالی دروستی کردووە، بەڵام کار و کردەوەی خراپی بەندەکان اللە دروستی نەکردووە، بەم شێوەیە هاوەڵیان لە سیفەتی دروستکردن دا بۆ اللە عز وجل دانا .

بەڵام عەقیدەی سەلەف رحمهم اللە ئەوەیە کە اللە تعالی هەموو شتێک ئەزانێت پێش ئەوەی کە ڕووبدات، وە نوسیویشیەتی، وەک چۆن رسول اللە ﷺ ئەفەرمووێت : (اللە عز وجل پەنجا هەزار ساڵ پێش دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی قەدەری دروستکراوەکانی نووسی ) .

وە هەرچی کرداری چاکە وخراپە هەیە ئەگەر ویستی اللە تعالی ی لەسەر نەبێت ڕوونادەن .

لێرەدا بابەتێکی تر دێتە پێشەوە، قەدەری شەرعی و قەدەری کەونی .

مەبەست لە قەدەری شەرعی بریتیە لەو فەرمانانەی کە اللە تعالی بە بەندەکانی کردووە و پێی خۆشە ئەنجامی بدەن، وەکو نوێژ و ڕۆژوو و هەموو کارێکی باشی تر .

بەڵام هەموو کارە خراپەکان وەکو دزی و زینا و کوفر و شیرک و هەموو کارەکانی دیکە اللە تعالی خۆشی ناوێن، وە پێی خۆش نییە بەندەکانی ئەنجامی

بدەن، بەڵام کاتێک بەندەیەکی ئەیەوێت ئەو کارە ئەنجام بدات ڕێگەی پێ ئەدات ئەنجامی بدەن لەبەر حیکمەتێک کە خۆی پێی شارەزاترە .



**٣٣٤** - **عبدالله بن أحمد بن حنبل** وتی : بیستم باوکم وتی ئەڵێت : (نوێژ ناکرێت لە پشت قەدەریەکان و موعتەزیلەکان و جەهمیەکان) .

**٣٣٥** - **عبدالله بن أحمد بن حنبل** وتی : گوێم لە باوکم رحمه الله بوو کە علي بن جهم پرسیاری لێکرد دەربارەی قەدەریەک، ئایا کافر ئەبێت ؟

وتی : (ئەگەر ئینکاری عیلمی کرد و وتی : الله عیلمی نەبووە تاوەکو عیلمی درووست کردووە جا زانیویەتی، ئەوە ئینکاری عیلمی الله عز وجل ی کردووە، ئەوە کافرە) .

**٣٣٦** - **معاذ بن معاذ** وتی : (نوێژم کرد لە پشت پیاوێك لە بني سعد، پاشان پێم گەیشتەوە کە قەدەری بووە، جا نوێژەکەم گێڕایەوە لە دوای چل دانە ساڵ یان سی دانە ساڵ) .

**٣٣٧** - **إبراهیم بن طهمان** وتی : (جەهمیەکان کافرن، وە قەدەریەکان کافرن) .

٢٣٨ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (الله قەدەرەکانی دیاری کردووە پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروست بکات) .

٢٣٩ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (بەندە ئیمانی نەهێناوە هەتا ئیمان نەهێنێت بە چوار شت : هەتاکو شاهێدی نەدات کە هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق کە شایەنی پەرستن بێت جگە لە الله، وە من نێردراوی الله م ناردوومی بە حەق، وە هەتا ئیمان نەهێنێت بە زیندوو بوونەوە دوای مردن، وە هەتا ئیمان نەهێنێت بە قەدەر) .

٢٤٠ - عمرو وتی : طاوس پێی وتین : (معبد الجهني ڕیسوا بکەن چونکە قەدەریە) .

٢٤١ - الحسن بن محمد بن علي وتی : (دامەنیشن لەگەڵ ئەهلی قەدەردا) .

٢٤٢ - عكرمة بن عمار وتی : (گوێم لە القاسم بن محمد و سالم بن عبد الله بوو لەعنەتیان لە قەدەریەکان ئەکرد ئەوانەی کە قەدەری الله عز وجل بە درۆ ئەخەنەوە هەتا ئیمان ئەهێنن بە خێر و شەڕی) .

٢٤٣ - عكرمة وتی : پرسیارمان کرد لە یحیی بن أبي كثير دەربارەی قەدەریەکان ؟

فەرمووی : (ئەوانەن کە دەڵێن الله قەدەری شەڕی دانەناوە) .

٣٤٤ - عمارة بن زاذان وتی : (پێم گەیشتووە كە قەدەریەكان لە ڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ موشریكەكان حەشر ئەكرێن، ئەڵێن : سوێند بە الله ئێمە موشریك نەبووین، پێیان ئەوترێت : ئێوە شەریكتان بڕیار دابوو لە شوێنێكەوە كە نەتانئەزانی، وە پێم گەیشتووە كە لە ڕۆژی قیامەت پێیان دەوترێت : ئێوەن دووژمنەكانی الله ـن عز وجل) .

٣٤٥ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (الله قەدەری مەخلوقاتی دیاری كردووە پێش ئەوەی كە ئاسمانەكان و زەوی دروست بكات بە پەنجا هەزار ساڵ) .

٣٤٦ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (الله عز وجل بۆ هەموو بەندەیەك پێنج شتی تەواو كردووە، ئەجەلەكەی، وە ڕزقەكەی، وە ئەوەی ئەنجامی ئەدات، وە جێگاكەی، وە بەدبەختە یان بەختەوەرە) .

٣٤٧ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (كاتێك الله عز وجل تەواو بوو لە دروست كردن لەسەر عەرشەكەی نووسی : ڕەحمەتم پێش تووڕەبوونم كەوتووە).

٣٤٨ - ميسرة الفجر رضي الله عنه فەرمووی : وتم : ئەی رسول الله كەی تۆ نوسرایت وەك پێغەمبەر ؟

فەرمووی : (ئادەم لە نێوان ڕۆح و جەستەدا بوو) .

: پرسیاری لێ ئەكات دەربارەی ئەوەی كە كەی دیاریكراویت بۆ ئەوەی ببیت بە پێغەمبەر، ئەویش ئەفەرموویێت كاتێک ئادەم علیه السلام دروست كرابوو بەڵام ڕۆحی بەبەردا نەكرابوو .

٣٤٩ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەی وەرگێڕی دڵەكان دڵم جێگیر بكە لەسەر دینەكەت ) .

٣٥٠ - علي رضي الله عنه ئەڵێت : (هیچ ئادەمیێك نیە ئیللا فریشتەیەك لەگەڵیدایەتی ئەیپارێزێت لە شتێک كە بۆی نەنوسرابێت لە قەدەردا ، جا كاتێك قەدەر هات بەجێی ئەهێڵێت بۆی ) .

٣٥١ - سعيد بن جبير دەربارەی فەرمایشتی | يَحُولُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ | (الأنفال : ٢٤) .

وتی : (نێوان ئیماندار و كوفر ئەگۆڕێت ، وە نێوان كافر و ئیمان ) .

٣٥٢ - قتادة وتی : پرسیارم كرد لە إبن المسيب دەربارەی قەدەر .

وتی : (ئەوەی الله عز وجل دایناوە ، ئەوە قەدەرە ) .

٣٥٣ - إياس بن معاوية وتی : (زاناترینی خەڵكی بە قەدەر لاوازەكانیانە).

وە وتی : (ئەگەر هەر لاوازێك نەچووبێتە نێو مشتومڕ لە قەدەردا، لە قسەكانیدا كاتێك قسە ئەكات، ئەڵێت : لە قەدەری الله ئاوا و ئاوا بوو).

**: بێگومان قسەکەی زۆر ڕاستە، زۆرجار ئەو موسوڵمانانەی کە زانیاریەکی وایان نییە یان کەسە بەتەمەنەکان باوەڕبوونیان بە قەدەری الله عز وجل یان زیاتر لێ دەرئەکەوێت لەچاو کەسانی دیکە .**

**٣٥٤ - سعيد بن جبير** دەربارەی فەرمایشتی الله تعالى : | **فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ** | (الدخان : ٤) .

وتی : (کاروباری ساڵێك تا ساڵێکی تر تەنها مردن و ژیان و بەدبەختی و بەختەوەری نەبێت) .

**٣٥٥ - أبا حازم** وتی : دەربارەی فەرمایشتی الله تعالى : | **فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا** | (الشمس : ٨) .

وتی : (فاجر الله تعالى ئیلهامی خراپەی بۆ کردووە، وە تەقواداریش الله عز وجل ئیلهامی تەقوای بۆ کردووە) .

**٣٥٦ - مجاهد** دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : | **إِنِّي أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ** | (البقرة : ٣٠) .

وتی : (ئەیزانی لە ئبلیس ـەوە سەرپێچی ڕووئەدات وە بۆ ئەوەش دروستی کرد) .

٣٥٧ - **عمرو بن ميمون** وتی : (گوێبیستی عمر بن الخطاب رضي الله عنه بووم لەو کاتەی بریندار کرا ئەیفەرموو : ﴿ **وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَقْدُورًا** ﴾ (الأحزاب : ٣٨) .

٣٥٨ - **إبن عباس** رضي الله عنه فەرمووی : (یەکەم شت الله دروستی کرد قەڵەم بوو ، پاشان پێی فەرموو : بنوسە .

وتی : چی بنوسم ؟

فەرمووی : بنوسەوە ئەوەی ڕوودەدات تا قیامەت ) .

**: واتە یەکەم شت کە پەیوەندی بە ژیان و ئاسمانەکان و زەویەوە هەیە ، ئەگینا پێش قەڵەم عەرش و ئاو هەبوون کە دروستکراون .**

٣٥٩ - **مطرف بن عبد الله بن الشخير** وتی : (لە قورئاندا نەدراوینەتە دەست قەدەر ، بەڵکو هەواڵمان پێدراوە لە قورئان کە ئێمە بەرەو ڕووی ئەچین ).

**: واتە نابێت کار نەکەیت و بڵێیت ئەگەر لە قەدەری الله عز وجل فلانە و فلانە بێت ڕووئەدات ، بەڵکو ئەبێت هەستی کار بکەیت ، جا ئەنجامی کارەکەت هەرچی بوو ئەوە ئەو قەدەریە الله عز وجل بۆ داناویت .**

**واتە کاتێک سەیارەیەکت پێیە و سەدوبیست لێی ئەخوڕیت و لە منداڵێک ئەدەیت ئەوە قەدەری الله یە ، وە کاتێک لەسەر چل ئەڕۆیت و بەباشی ئاگاداری خۆتیت و لە هیچ**

**کەسێک نادەیت ئەوەش هەر قەدەری الله تعالی یە، جا الله تعالی عەقڵی پێداویت تا بەکاریبهێنیت و خێرا سەیارەکە لێنەخوڕیت .**

٣٦٠ - مولی ی إبن أبي رواد وتی : طاوس لە مەککە نوێژی ئەکرد، وە دوو پیاو لە پشتیەوە مشتومڕیان دەکرد لە قەدەردا، جا ڕووی تێکردن و وتی : (الله ڕەحمتان پێبکات، مشتومڕ ئەکەن دەربارەی حوکمی الله عز وجل ؟!) .

٣٦١ - میمون بن مهران وتی : (جنێو مەدەن بە هاوەڵانی پێغەمبەر علیه السلام، وە فێری ئەستێرەناسی مەبن، وە دامەنیشن یان مشتومڕ مەکەن لەگەڵ ئەهلی قەدەر) .

---

: مەبەستی لە (ئەستێرەناسی) ئەوەیە کە ئەمڕۆ پێی ئەوترێت بورجەکان .

٣٦٢ - إبن عباس رضي الله عنهما فەرمووی : (هیچ کۆمەڵەیەک نییە بوغزێنراوتر بن لە لای الله وەك لە قەدەریەکان، ئەوان هێزی الله عز وجل نازانن، الله عز وجل ئەفەرموێت : | لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ | (الأنبياء : ٢٣) .

٣٦٣ - طاوس اليماني وتی : گەیشتم بە خەڵکانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئەیانفەرموو : (هەموو شتێك بە قەدەرە) .

وه گوێم له عبد الله بن عمر بوو وتی : رسول الله ﷺ فەرمووی : (هەموو شتێك بە قەدەرە هەتا بێتوانایی و بزێویش) .

٣٦٤ - نافع وتی : إبن عمر هاوڕێیەكی هەبوو لە خەڵكی شام نامەی بۆ ئەنوسی ، جا نامەیەكی بۆ نوسی : له عبد الله بن عمر : پێم گەیشتووە كە قسەت كردووە لە شتێكدا لە قەدەر ، جا ئاگاداربە لەوەی كە نامە بۆ من بنوسی - واتە چیتر نامەم بۆ مەنێرە - ، چونكە من گوێم لە رسول الله ﷺ بوو فەرمووی : (كەسانێك لە ئوممەتەكەم پەیدا ئەبن كە قەدەر بە درۆ ئەخەنەوە) .

٣٦٥ - أبي هريرة رضي الله عنه فەرمووی : (موشریكانی قورەیش هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ مشتومڕیان كرد لەگەڵی دەربارەی قەدەر ، جا ئەمە دابەزی : ﴿يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾ (القمر : ٤٩) .

لەسەر ئەهلی قەدەر) .

٣٦٦ - محمد بن كعب وتی : (ئەم ئایەتە دابەزی : ﴿يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾ (القمر : ٤٩) .

لەسەر ئەهلی قەدەر) .

٣٦٧ - موسى بن وردان وتی : أبي هريرة رضي الله عنه فەرمووی : (كەسانێك پەیدا ئەبن قەدەر بەڕاست ئەخەنەوە و قەدەر بە درۆ ئەخەنەوە) .

موسى وتی : (جا أبو هريرة رضي الله عنه لەعنەتی لێ كردن لە كاتی ئەم قسانەیدا) .

---

**: وتەی (قەدەر بەڕاست ئەخەنەوە و قەدەر بە درۆ ئەخەنەوە) واتە ئەڵێن فلانە شت قەدەری الله یە وە فلانە شت قەدەری الله نییە .**

**٣٦٨** - **يحيى بن يعمر** وتی : (وتم بە إبن عمر یان پیاوێك پێی وت : ئێمە سەفەر ئەكەین جا ئەگەین بە كەسانێك ئەڵێن : قەدەر نییە ؟!

فەرمووی : (ئەگەر گەیشتی بەوانە هەواڵیان پێبدە كە إبن عمر لەوان بەرییە، وە ئەوانیش لەو بەریین) سێ دانە جار) .

**٣٦٩** - **أبي حجاج الأزدي** وتی : لە ماسبذان گەیشتم بە سلمان، لێم پرسی : هەواڵم پێبدە ئیمان بوون بە قەدەر چۆنە ؟

فەرمووی : (ئەوەیە بزانیت ئەوەی كە تووشت هاتووە نەئەبوو كە بەسەرتدا نەیەت، وە ئەوەی كە بەسەردا نەهاتووە نەئەبوو كە تووشت ببێت .

وە نەڵێیت : ئەگەر ئەمە نەبووایە، ئەوە ئەبوو، وە ئەگەر ئەمەی نەكردایە، ئەوە ئەبوو) .

٣٧٠ - إبن عباس رضي الله عنهما فەرمووی : (ئیمان بوون بە قەدەر ڕێکخەری تەوحیدە، هەر کەسێك ئیمان بێنێت و قەدەر بە درۆ بخاتەوە ئەوە هەڵوەشێنەرەوەیە بۆ تەوحید) .

٣٧١ - عمار مولى ى بني هاشم وتی : (پرسیارم کرد لە أبا هريرة دەربارەی قەدەر ؟

فەرمووی : کۆتایی سورەتی الفتح ت بەس بێت) .

---

: مەبەستی لەم ئایەتەیە : | مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا | (الفَتْح : ٢٩) .

لەم ئایەتەدا یەکەمجار باسی چەند سیفەتێکی هاوەڵان ئەکات رضي الله عنهم، پاشان ئەفەرمووێت | . . . ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ . . . | .

ئەمە نمونەیانە لە تەورات و نمونەیانە لە ئینجیل .

واتە لە تەورات و ئینجیل دا باسکراوە کە هاوەڵانی رسول الله ﷺ بەو شێوەیەن، کەواتە الله عز وجل زانیویەتی کە هاوەڵانی چۆنن، هەربۆیە لە تەوراتدا و ئینجیل دا نووسیویەتی کە بەو شێوەیەن .

٣٧٢ - إبن الديلمي وتی : پرسیارم كرد لە عبد الله بن عمرو رضي الله عنه دەربارەی وشك بوونەوەی قەڵەم ؟

فەرمووی : (بەڕاستی الله عز وجل كاتێك دروستكراوەكانی دروست كرد، لە نووری خۆی هەڵدایە سەریان، جا هەر كەسێك شتێكی بەركەوتبێت لێی - واتە لەو نوورە - ئەوە هیدایەتی وەرگرتووە) .

٣٧٣ - الحسن البصري وتی : (هەر كەسێك قەدەر بە درۆ بخاتەوە، ئەوا قورئانی بە درۆ خستووەتەوە) .

٣٧٤ - عمر بن عبدالعزيز وتی : (ئەگەر الله عز وجل بیویستایە كە سەرپێچی نەكرێت ئیبلیس ی دروست نەئەكرد، پاشان ئەمەی خوێندەوە : | مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ بِفَاتِنِينَ إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ الْجَحِيمِ | (الصافات : ١٦٣) .

٣٧٥ - مجاهد دەربارەی فەرمایشتی عز وجل : | إِنِّي أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ | (البقرة : ٣٠) .

وتی : (ئەیزانی لە ئیبلیس ەوە سەرپێچی ڕووئەدات، وە بۆ ئەوەش دروستی كرد) .

٣٧٦ - مجاهد دەربارەی فەرمایشتی : | لَهُمْ أَعْمَالٌ مِنْ دُونِ ذَلِكَ هُمْ لَهَا عَامِلُونَ | (المؤمنون : ٦٣) .

وتی : (كارانێك كه هەر ئەبوو بیانكردایه ) .

٣٧٧ - أبي صالح دەربارەی فەرمایشتی : ﴿مَا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللَّهِ وَمَا أَصَابَكَ مِنْ سَيِّئَةٍ فَمِنْ نَفْسِكَ﴾ (النساء : ٧٩) .

وتی : (وه من به قەدەر دامناوه لەسەرت ) .

٣٧٨ - محمد بن كعب القرظي وتی : دابەزی وەك عەیبدارکردنێک بۆ ئەهلی قەدەر : ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾ (القمر : ٤٩) .

٣٧٩ - إبن عون وتی : (غیلان م بینی به هەڵواسراوی لەسەر دەروازەی دیمەشق ) .

٣٨٠ - منصور بن عبدالرحمن وتی : (پرسیارم کرد له الحسن دەربارەی وتەی : ﴿وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ إِلَّا مَنْ رَحِمَ رَبُّكَ﴾ (هود : ١١٩) .

وتی : (خەڵکی جیاوازن لەسەر دینه جیاوازەکان مەگەر ئەوه نەبێت که پەروەردگارت ڕەحمی پێکردووه، وه هەر کەس ڕەحمی پێکرابێت لانادات - واته له تەوحید - ) .

جا وتم : ﴿وَلِذَلِكَ خَلَقَهُمْ﴾ ؟

وتی : (بەڵێ، ئەوانەی بۆ بەهەشتەکەی دروست کردووە، وە ئەوانەشی بۆ ئاگرەکەی دروست کردووە، وە ئەوانەی بۆ ڕەحمەتەکەی دروست کردووە، وە ئەوانەشی بۆ عەزابەکەی دروست کردووە).

**٣٨١** - سیار وتی : عمر بن عبدالعزيز رحمه الله دەربارەی قەدەریەکان وتی : (ئەگەر تەوبەیان کرد باشە، وە ئەگەر نا لە وڵاتی موسڵمانان دوور ئەخرێنەوە).

**٣٨٢** - أبي سهيل وتی : من لەگەڵ عمر بن عبد العزيز بووم رحمه الله ج پێی وتم : بۆچوونت چییە دەربارەی ئەو قەدەریانە؟

وتم : وایدەبینم کە تۆبەیان پێ بکرێت، جا ئەگەر ئەمەیان قبوڵ کرد باشە، وە ئەگەر نا دەیانخەمە بەر شمشێر.

جا عمر بن عبدالعزيز وتی : ئەمە ڕاو و بۆچوونی منیشە.

جا وتم بە مالك : ئەی ڕای تۆ چییە؟

وتی : ئەوە ڕاو و بۆچوونی منیشە).

**٣٨٣** - عبدالعزيز بن عبد الله بن أبي سلمة - واته إبن الماجشون - وتی : (گوێم لە نافع ی مەولای إبن عمر بوو ئەیوت بەو ئەمیرەی کە لەسەر مەدینە بوو : الله تعالى چاکت بکات، بیدە لە ملیان، واتە : قەدەریەکان.

من لەو ڕۆژەدا قەدەری بووم، هەتا لە خەومدا بینیم وەك ئەوەی من لەگەڵ کەسێکدا مشتومڕ بکەم، جا ئایەتێکم خوێندەوە.

کاتێك بەیانیم کردەوە هاوەڵانم هاتن بۆ لام.

وتم : من داوای لێخۆش بوون لە الله ئەكەم و ئەگەڕێمەوە بۆ لای، پاشان ئەوەم پێڕاگەیاندن كە بینیبووم .

جا هەندێكیان گەڕانەوە، وە هەندێكیشیان پشتیان كرد لەوەی كە بگەڕێنەوە).

**٣٨٤** - لە **عبد الله بن عبدالرحمن بن كعب بن مالك** لە علي بن أبي طالب ـەوە رضي الله عنه كە : ڕۆژێك باسی قەدەر كرا لە لای، جا پەنجەی شایەتمان و ناوەڕاستی خستە ناو دەمیەوە، بە هەردوو پەنجەكەی ژمارەی نووسی لەناو لەپی دەستی .

دواتر فەرمووی : شایەتی ئەدەم كە ئەم دوو ژمارەیە لە أم الكتاب - **لوح المحفوظ** - بوونی هەبووە) .

**٣٨٥** - **محمد بن سیرین** وتی : (ئەگەر قەدەریەكان لەوانە نەبن كە مشتومڕ ئەكەن دەربارەی ئایەتەكانی الله عز وجل ئەوە نازانم ئەوانە كێن) .

**٣٨٦** - **إبن عمر** رضي الله عنه فەرمووی : (هەر كەسێك پێی وابێت كە لەگەڵ الله عز وجل دا بەدیهێنەرێك هەیە یان دادوەرێك هەیە یان ڕزقدەرێک هەیە دەسەڵاتی هەبێت بۆ نەفسی خۆی بە زیاند یان سوود یان مردن یان ژیان یان زیندووبونەوە، ئەوە الله عز وجل زیندووی ئەكاتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا زمانی لاڵ ئەكات و بینینی كوێر ئەكات وە كردەوەكانیشی ئەكات بە تۆزی با بردوو، وە هەموو هۆیەكانی نێوانیان دەپچڕێنێت، وە لەسەر ڕووخساری ڕایئەكێشێت بۆ ناو ئاگر) .

٣٨٧ - نافع وتی : وترا به إبن عمر رضي الله عنه :كەسانێك هەن ئەڵێن : قەدەر نییه .

فەرمووی : (ئەوانه قەدەریەكانن ، ئەوانه مەجوسی ئەم ئوممەتەن ) .

٣٨٨ - منصور بن عبدالرحمن الغداني وتی : (وتم به الحسن : وتەی الله عز وجل : | مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنْفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا | (الحديد : ٢٢) .

وتی : سبحان الله ، كێ گومانی هەیه لەمه ؟

هەموو ناخۆشیەک لە نێوان ئاسمان و زەوی لە كیتابی الله دایه .

| مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا | : پێش ئەوەی دروستیان بكات ) .

## باب : (١٣)

## ئەوەی زانایان وتوویانە دەربارەی عمرو بن عبيد



(عمرو بن عبيد يەكێكە لە ئیمامەكانی بەناو عیلمی الكلام و ئیعتیزال و قەدەر، وە یەكێك بووە لەوانەی كە لە گێڕانەوەی فەرموودەدا درۆی كردووە، لەگەڵ ئەو هەموو كوفر و گومڕاییەشدا تانەی داوە لە هاوەڵان رضي الله عنهم، وە ڕەتكەرەوەی قورئان و فەرموودە بووە و دوژمنی الله تعالى و پێغەمبەرەكەی ﷺ بووە .

- ئیمامی أحمد دەربارەی عمرو بن عبيد ئەڵێت : (دانی نەدەنا بە عیلم دا، وە ئەوەش كوفرە بە الله عز وجل) .

**السنة للخلال : ٨٥٠**

- إبن حبان دەربارەی عمرو بن عبيد ئەڵێت : (جوێنی ئەدا بە هاوەڵان، وە لە فەرموودەدا درۆی ئەكرد) .

**المجروحين**

- الهروي ئەڵێت : (عمرو بن عبيد یەكەم كەس بوو بناغەی بۆ دانا **- واتا یاسا و قاعیدەی بۆ عەقیدەی قەدەریەكان دانا -** ، وە بوو بە پێشەوایان و بانگەوازی بۆ ئەكرد، وە ئیمامی الكلام **- بەناو عیلمی كەلام كە هەموو موتەكەلیمینی تووشی كوفر**

كردووە - بوو، وە بانگەوازكاری یەكەمی زەندەقە و سەرگەورەی موعتەزیلەكانە، وە ئیمامی مالک لەعنەتی لێ كردووە، جا الله عز وجل شمشێرێک لە شمشێرەكانی ئیسلامی زاڵ كرد بەسەریدا، ئەویش أیوب السختیاني - تەلەبەی حسن البصري - بوو، جا نهێنیەكانی هەڵماڵی و عەیبەكانی دەرخست و زۆر لەعنەتی لێ ئەكرد).



٣٨٩ - ثابت البناني وتی : (عمرو بن عبید م بینی موصحەفی ئەكوژادنەوە.

جا وتم : ئەوە چی ئەكەیت ؟

وتی : لە شوێنەكەی شتێكی باشتر دائەنێم!).

---

: واتە ئەو كافرە ئایەتێكی خوێندووەتەوە و بەدڵی نەبووە، ئیتر سڕیویەتیەوە و وتوویەتی لەجێگەی ئەو ئایەتە شتێكی باشتر دائەنێم !

٣٩٠ - حماد بن زید وتی : (من لەگەڵ أیوب و یونس و إبن عون و بێجگە لەوانیش بووم، جا عمرو بن عبید تێپەڕی بەلایاندا، سەلامی لێكردن، وە وەستانێك وەستا، وەڵامی سەلامەكەیان نەدایەوە، پاشان تێپەڕی و هیچ باسیان نەكرد).

**٣٩١** - **على بن الحسن بن شقيق** وتی : (وتم بە عبد الله واتە : ابن المبارك گوێبیستی عمرو بن عبید بوویت ؟

ئەڵێت : بەدەستی ئاماژەی کرد، واتە : زۆر .

وتم : ئەی بۆچی ناوی ناهێنیت، وە تۆ ناوی بێجگە ئەو ئەهێنیت لە قەدەریەکان ؟

وتی : لەبەر ئەوەی ئەمە سەرگەورە بوو) .

**٣٩٢** - **معاذ بن مكرم** وتی : (إبن عون منی بینی لەگەڵ عمرو بن عبید لە بازاڕدا .

جا ڕووی لێوەرگێڕام، منیش پاساوم بۆ هێنایەوە .

وتی : بەڵکو من تۆم بینی ئیتر لەوە زیاتر چیم پێ ئەڵێیت ؟!) .

**٣٩٣** - **سفيان بن عيينة** وتی : (عمرو بن عبید وتی : ئایا باوکت ڕێگری لێکردوویت کە دابنیشیت لەگەڵم ؟

وتم : بەڵێ) .

**٣٩٤** - **أبو عوانة** وتی : (عمرو بن عبید م نەبینیوە و هەرگیز لەگەڵیدا دانەنیشتووم تەنها یەك جار نەبێت، قسەی کرد و درێژی پێدا و پاشان کاتێك تەواو بوو وتی : ئەگەر فریشتەیەك لە ئاسمانەوە دابەزێت لەمە زیاترتان پێ ناڵێت ! ) .

**٣٩٥ - حرب بن ميمون** وتى : (عمرو بن عبيد م بينى نوێژى بۆ خەڵكانێك ئەكرد و لەگەڵیاندا بوو لە ڕیزەكەدا .

جا پرسیارم كرد لە إبن فضاء وتى : ئەمە كەسێكى بیدعەچییە ) .

**٣٩٦ - أيوب** وتى : (هەرگیز عمرو م بە ئاقڵ دانەناوە ) .

**٣٩٧ - سلام بن أبي مطيع** وتى : سعيد بە أيوب ی وت : ئەی أبا بكر، عمرو بن عبيد گەڕاوەتەوە لە وتەكەی **- واتە تۆبەی كردووە لە عەقیدەی موعتەزیلە و قەدەریەكان -** .

سلام وتى : وە خەڵكى لەو ڕۆژانەدا ئەیانوت كە ئەو گەڕاوەتەوە .

جا أيوب وتى : ئەو نەگەڕاوەتەوە .

پێم وت : بەڵێ، بەڵكو گەڕاوەتەوە .

وتى : ئەو نەگەڕاوەتەوە .

ئەمەی وتەوە زیاتر لە جارێك، پاشان أيوب وتى : ئایا گوێت لە ووتەكەی نەبووە - واتە : لە فەرمووددا : دەرئەچن لە دین وەكو چۆن تیر لە نێچیرەكە دەرئەچێت، پاشان ناگەڕێنەوە هەتاوەكو و تیرەكە نەگەڕێتەوە شوێنی خۆی )؟

ئەو هەرگیز ناگەڕێتەوە .

٣٩٨ - حماد بن زيد وتی : پیاوێك بە أيوب ی وت : عمرو بن عبيد ڕیوایەت ئەكات لە الحسن ـەوە كە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (ئەگەر معاوية تان بینی لەسەر مینبەر بیكوژن) .

أيوب وتی : عمرو درۆ ئەكات .

٣٩٩ - حماد بن زيد وتی : (وترا بە أيوب : عمرو ڕیوایەت ئەكات لە الحسن ـەوە كە وتوویەتی : سەرخۆش جەڵد ناكرێت لەسەر النبيذ - جۆرێكە لە خواردنەوە سەرخۆشكەرەكان - .

وتی : درۆی كردووە، من گوێم لە الحسن بوو ئەیوت : سەرخۆش جەڵد ئەكرێت لەسەر النبيذ) .

٤٠٠ - عباد بن منصور وتی : (من و عمرو بن عبيد تەفسیری سورەتەكانی هود و الرعد ـمان بیست لە الحسن ـەوە، جا پاش ئەوە ئەو زۆرتری باسئەكرد لەوەی كە بیستبوومان .

پێم وت : ئەی أبا عثمان، من و تۆ بیستمان لە الحسن، ئەی ئەو هەموو زیادەیە چییە ؟

وتی : ئەمە قسەیانێكە زیادم كردوون هەتا دڵیانی پێ نەرم بكەم) .

٤٠١ - بكير بن حمران وتی : ئێمە لەلای إبن عون بووین، جا پیاوێك پێی وت : چی دەڵێیت دەربارەی ئەوە و ئەوە ؟

وتی : نازانم .

پیاوه‌كه‌ وتی : عمرو بن عبيد ڕیوایه‌ت ئه‌كات له‌ الحسن ـه‌وه‌ ئاوا و ئاوا .

وتی : چیمان داوه‌ له‌ عمرو، عمرو درۆی ئه‌كرد به‌ده‌م الحسن ـه‌وه‌) .

٤٠٢ - عثمان بن عثمان وتی : ئێمه‌ له‌لای معاذ بن معاذ بووین، باسی عمرو كوڕی عبيد كرا، وتی : باسی فه‌رمووده‌ی أبي بكر الصديق رضي الله عنه كرا له‌لای عمرو بن عبيد، جا وتی : ئه‌گه‌ر بمبیستایه‌ له‌ أبي بكر ـه‌وه‌ به‌ڕاستم نه‌ئه‌خسته‌وه‌، وه‌ ئه‌گه‌ر بمبیستایه‌ له‌ پێغه‌مبه‌ر ـه‌وه‌ ﷺ لێم وه‌رنه‌ئه‌گرت، وه‌ ئه‌گه‌ر گه‌شتمه‌وه‌ به‌ الله عز وجل، پێی ئه‌ڵێم : له‌سه‌ر ئه‌مه‌ دروستت كردووین ؟!) .

٤٠٣ - يحيى البكاء وتی : (پارچه‌ وه‌ره‌قه‌یه‌ك له‌لایه‌ن عمرو بن عبيد ـه‌وو هاته‌ لای الحسن كه‌ چه‌ند پرسیارێكی تێدابوو، جا كاتێك زانی له‌لایه‌ن ئه‌وه‌وه‌ بووه‌، هیچ وه‌ڵامێكی نه‌دایه‌وه‌) .

## باب : (١٤)

## جێگیرکردنی دوو چاو بۆ الله عز وجل، وه ئه‌وه‌ی هاتووه ده‌رباره‌ی ده‌جال و تایبه‌تمه‌ندیه‌کانی



(ده‌جال یه‌کێکه له فیتنه هه‌ره‌گه‌وره‌کان و چه‌ندین فه‌رمووده ی صحیح ده‌رباره‌ی هاتووه، وه ئیمامه‌کانی ئه‌هلی سوننه وه‌کو أحمد بن حنبل و علي بن المديني و حرب الكرماني و البربهاري و الآجري و أبو عوانة الإسفراييني زۆرێکی تر له عه‌قیده‌کانیدا باسیان کردووه و ئه‌هلی سوننه باوه‌ڕیان به‌وه هه‌یه که که‌سێک به‌ناوی ده‌جال پێش قیامه‌ت ده‌رئه‌چێت .

وه هه‌ر له ڕێگه‌ی ئه‌و فه‌رمووده‌یانه‌ی که باسی ده‌جالی تێدا کراوه سه‌له‌ف سیفه‌تی (دوو چاو) یان بۆ الله عز وجل جێگیر کردووه .

له کتێبی (نقض الدارمي على المريسي) ی عثمان بن سعيد الدارمي رحمه الله باب ێک هه‌یه به‌ناوی (الكلام عن إثبات صفة العين لله تعالى)، واته قسه‌کردن له‌سه‌ر جێگیرکردنی سیفه‌تی چاو بۆ الله تعالى، وه له هه‌مان کتێبدا ئه‌ڵێت : (له فه‌رمووده‌ی رسول الله ﷺ ' الله چاوێکی کوێر نییه ' ، نیشانه‌ی ئه‌وه‌ی تێدایه که الله بینه‌ره خاوه‌نی دوو چاوه به خیلافی که‌سێک که چاوێکی کوێره ' ) .

- وه إبن خزيمة رحمه الله له كتێبى (كتاب التوحيد) دا باب ێكى هێناوه به ناوى (باب ذكر إثبات العين لله جل و علا، على ما ثبته الخالق البارئ لنفسه في محكم تنزيله وعلى لسان نبيه المصطفى ﷺ) .

لەم باب ەدا دێت به بەڵگەى ئايەتى قورئان ئەيسەلمێنێت كه الله عز وجل خاوەنى چاوه، پاشان دێت ٦ فەرموودە ئەهێنێتەوە دەربارەى سيفەتەكانى دەججال .

چەند نمونەيكى تر هەيە بەڵام بەوەندە كۆتايى پێ ئەهێنين .

- إبن القيم له كتێبى (إجتماع الجيوش الإسلامية على حرب المعطلة والجهمية) دا ئەڵێت : (باسى دەججال، وه ئەوەى كه كوێرە، فەرموويەتى (پەروەردگارى ئێوه چاوێكى كوێر نييه)، كەواته دوو چاوى بۆ جێگير كرد) .



**٤٠٤** - له **عائشة** ەوه رضي الله عنها، كه پێغەمبەرى الله ﷺ چووەته ژوورەوە بۆ لاى وه ئەو ئەگريا، فەرمووى : (چى ئەتگريێنێت ؟)

وتى : بيرم له دەججال كردەوە گريام .

فەرمووى : (مەگرى، ئەگەر ئەو دەربچێت و من زيندوو بم، من بەس ئەبم بۆتان، وه ئەگەر مردم ئەوا پەروەردگارم چاوێكى كوێر نييه - **واته دەججال يەك چاوى كوێرە بەڵام پەروەردگار دوو چاوى هەيە و كوێر نين** - ) .

٤٠٥ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (وەسفی دەججالتان بۆ ئەكەم بە وەسفێك كە ئەوانەی پێش من ئاوا وەسفیان نەكردووە، ئەو چاوێكی كوێرە، وە الله عز وجل چاوێكی كوێر نییە).

٤٠٦ - إبن عمر رضي الله عنهما وتی : رسول الله ﷺ هەستا لەناو خەڵكیدا وەسف و سەنای الله عز وجل ی كرد بەوەی كە شایەنی بوو، پاشان باسی دەججالی كرد و فەرمووی : (من ئاگادارتان ئەكەمەوە لێی، وە هیچ پێغەمبەرێك نەبووە ئیللا قەومەكەی لێ ئاگادار كردووەتەوە، نوح علیه السلام قەومەكەی ئاگادار كردووەتەوە، بەڵام من دەربارەی وتەیەكتان پێئەڵێم كە هیچ پێغەمبەرێك نەیفەرمووە بە قەومەكەی : ئەزانن ئەو چاوێكی كوێرە، وە الله عز وجل چاوێكی كوێر نییە).

٤٠٧ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (بەڕاستی دەججال چاوێكی كوێرە، وە بەڕاستی الله عز وجل چاوێكی كوێر نییە، لە نێوان چاوەكانی نوسراوە : كافر، هەموو ئیماندارێك ئەیخوێنێتەوە، خوێندەوار و نەخوێندەوار).

٤٠٨ - أبي أمامة الباهلي رضي الله عنه وتی : رسول الله ﷺ وتاری بۆ ئەداین زۆرترینی وتارەكەی ئاگادار كردنەوە بوو دەربارەی دەججال، ئەیفەرموو : (سەرەتا كە دەست پێئەكات ئەڵێت : من پێغەمبەرم، پاشان ستایش ئەكرێت، جا ئەڵێت : من پەروەردگارتانم، وە پەروەردگارتان عز وجل نابینن هەتا نەمرن، وە ئەو چاوێكی كوێرە، بەڕاستی پەروەردگارتان چاوێكی كوێر نییە، هەر كەسێك پێیگەیشت با تف بكات لە ڕووخساری).

## باب : (١٥)

## الرد على الجهمية



(ئیمام لەم باب ـەدا چەندین فەرموودە و ئەثەری جۆراوجۆری هێناوە کە ڕەددە بۆ پەکخەرانی سیفاتەکانی الله تعالى و بەدرۆخەرەوەی الله تعالى و پێغەمبەرەکەی .

هەر سیفەتێک کە لەم ئاثارانەدا هاتووە سەلەف جێگیری ئەکەن و جەهمیەکانیش ڕەتی ئەکەنەوە و بگرە بە کوفر و تەشبیهـ و تەجسیم ی ئەزانن .

ئیمامەکانی تری ئەهلی سوننە وەکو البخاري رحمه الله کۆتا کتاب ی الصحيح ـەکەی ناو ناوە (التوحيد) یان (الرد على الجهمية)، وە لەناویدا ئەو فەرموودەیانەی هێناوە کە ڕەددی جەهمیە پەکخەرەکانی تێدایە .

وە چەند زانایەکیش بە کتێبی جیا ڕەددی جەهمیەکانیان داوەتەوە و لەسەریان نووسیون، وەکو (الرد على الجهمية) ی ئیمام أحمد و ئیمام الدارمي و إبن منده.



٤٠٩ - **عمر** رضي الله عنه فەرمووی : (كاتێك تبارك وتعالى دائەنیشێت لەسەر كورسی ، أطيط ێک ئەبیسترێت لێوەی وەكو دەنگی سواریەكی تازە ) .

---

: (أطيط ) دەنگێكە بەهۆی قورسیەوە دروست ئەبێت .

٤١٠ - **إبن عباس** رضي الله عنهما فەرمووی : كورسی جێگای دوو پێیەكانە **- هی الله عز وجل -** ، وە عەرش كەس گەورەییەكەی نازانێت ) .

٤١١ - **أبي مالك** دەربارەی فەرمایشتی عز وجل : ﴿ **وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ** ﴾ .

وتی : (بەڕاستی ئەو بەردەی لە ژێر زەوی حەوتەمدایە و كۆتایی درووستكراوەكانە ، لە لایەكانیەوە چوار فریشتە هەیە بۆ هەر فریشتەیەك چوار دانە ڕووخسار هەیە : ڕووخساری ئینسان ، وە ڕووخساری شێر ، وە ڕووخساری هەڵۆ ، وە ڕووخساری گا ، جا لەسەری وەستاون زەوی و ئاسمانەكانیان گرتووەتەوە ، وە سەریان لە ژێر كورسیە ، وە كورسی لەلای عەرشە ، وە ئەو **- واتە الله عز وجل -** پێیەكانی داناوە لەسەر كورسی ) .

٤١٢ - **رسول الله ﷺ** فەرمووی : (**ئەگەر یەكێكتان دای** - لە كەسێك - **ئەوا با خۆی بپارێزێت لە ڕووخسار ، وە نەڵێت : الله ڕووخسارت ناشرین بكات وە ڕووخساری ئەوەشی لە ڕووخساری تۆ ئەچێت** ) .

٤١٣ - قتادة و الحسن دەربارەی فەرمایشتی عز وجل : | لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ | (البقرة : ٢٥٥) .

وتیان : (السِّنَةُ خەو بردنەوەیە) .

٤١٤ - أبي صالح دەربارەی فەرمایشتی عز وجل : | وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ * إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ | (القيامة: ٢٣) .

وتی : (ئاسوودەیی و گەشاوەیی بەوەی کە تێیدایە لە نیعمەتی ڕووانین بۆ پەروەردگاری) .

٤١٥ - الحسن دەربارەی فەرمایشتی عز وجل : | وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ * إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ | (القيامة: ٢٣) .

وتی : (الناضرة : جوانن ، الله جوانی کردووە بە ڕووانین بۆ پەروەردگاری عز وجل ، وە مافی ئەوەی هەیە کە گەشاوە بێت لە کاتێکدا سەیری پەروەردگارەکەی و گەورەکەی ئەکات عز وجل) .

٤١٦ - عكرمة دەربارەی فەرمایشتی : | السَّمَاءُ مُنْفَطِرٌ بِهِ | (المزمل: ١٨) .

ئەڵێت : (قورس بووە پێی - واته به الله عز وجل - ) .

٤١٧ - قتادة دەربارەی فەرمایشتی : | السَّمَاءُ مُنْفَطِرٌ بِهِ | (المزمل: ١٨) .

وتی : (قورس بووه پێی) .

٤١٨ - **الحسن** دەربارەی فەرمایشتی : ﴿**السَّمَاءُ مُنْفَطِرٌ بِهِ**﴾ (المزمل: ١٨).

وتی : (قورس بووه پێی) .

٤١٩ - **إبن عباس** رضي الله عنهما فەرمووی : (ئایا بەلاتانەوە جێگەی سەرسامیە كە خۆشەویستی بۆ إبراهیم بێت، وە قسە بۆ موسی بێت، وە بینین بۆ محمد بێت ﷺ؟) .

٤٢٠ - **أبي عطاف** وتی : (الله عز وجل تەوراتی بە دەستی خۆی نووسی بۆ موسی، وە - **موسی علیه السلام** - پاڵی دابوو بە بەردێكەوە، لە كۆمەڵە لەوحێكی مرواریدا، جا گوێی لە دەنگی نووسینی قەڵەمەكە بوو، لە نێوان ئەم و ئەودا - **واتە الله تعالی و موسی علیه السلام** - هیچ شتێك نەبوو ئیللا پەردە نەبێت) .

٤٢١ - **رسول الله** ﷺ فەرمووی : (**بەڕاستی الله عز وجل ناخەوێت، وە ناگونجێت بۆ ئەو كە بخەوێت، تەرازوو نزم ئەكاتەوە و بەرز ئەكاتەوە، كردەوەی ڕۆژ بەرز ئەبێتەوە بۆ لای پێش شەو، وە كردەوەی شەویش پێش ڕۆژ، پەردەكەی ئاگرە، ئەگەر لایبدات ئەوا هەموو شتێك كە بینینی پێی بگات ئەسوتێت لەبەر ڕووخساری**) .

٤٢٢ - **رسول الله** ﷺ فەرمووی : (**بەڕاستی الله عز وجل پێئەكەنێت بە دوو پیاو كە یەكێیان ئەوی تریانی كوشتووە، جا هەردووكیان پێكەوە ئەچنە**

بەهەشتەوە، - یەکێکیان - کافربوو موسڵمانێکی کوشت، پاشان کافرەکە موسڵمان بوو پێش ئەوەی بمرێت، الله عز وجل هەردووکیانی خستە بەهەشتەوە).

٤٢٣ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەگەر یەکێکتان دای - لە کەسێك - ئەوا با دوور بکەوێتەوە لە ڕووخسار چونکە الله ئادەمی لەسەر وێنەی خۆی درووست کردووە).

---

: (لەسەر وێنەی خۆی) واتە لەسەر وێنەی الله عز وجل .

٤٢٤ - عبدالله بن أحمد بن حنبل وتی : باوکم وتی : گوێم الحمیدي بوو، وە سفیان ئەم فەرموودەیەی بۆ باسکردین - مەبەستی فەرموودەی صورة یە - ، ئەیوت : ئەمە حەقە وە ئەمە حەقە وە قسەی پێئەکرد .

وە إبن عیینة بێدەنگ بوو .

باوکم وتی : ئینکاری وتەکەی لێنەئەکرد وەکو ئەوەی پێی باش بێت).

---

: ئەهلی سوننە و جەماعە کە شوێنکەوتەی بە حەقی رسول الله ن ﷺ لە کۆن و نوێدا ئەم فەرموودەیەیان بەڕاست خستووەتەوە و باوەڕیان پێ کردووە لەسەر ڕووکەش وەریان گرتووە، وە جەهمیەکان لە کۆن و نوێدا ئەم فەرموودە و چەندین فەرموودەی تری سیفاتیان ڕەتکردووەتەوە .

٤٢٥ - أسماء بنت يزيد بن سكن وتی : (كاتێک سعد بن معاذ مرد، دایكی هاواری كرا، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بە دایكی سعد بن معاذ : بۆ ئەوەی فرمێسكەكەت بوەستێت و خەمەكەت بڕوات، بەڕاستی كوڕەكەت یەكەم كەس بوو كە الله عز وجل بۆی پێكەنی، وە عەرش بۆی لەرزی ).

٤٢٦ - جعفر بن سليمان وتی : أبي عمران وتی : (الله سەیری هیچ شتێك ناكات ئیللا ڕەحمی پێئەكات ).

وە سوێندی خوارد و وتی : (سوێند بە الله ئەگەر الله سەیری ئەهلی ئاگری بكردایە ئەوا ڕەحمی پێئەكردن، بەڵام بڕیاری داوە كە سەیریان نەكات ).

٤٢٧ - سليمان وتی : الحسن وتی : (عەرشی الرحمن جل وعز هاتە لەرزین بۆ جەنازەی سعد رضي الله عنه ).

: الحسن تەفسیری كرد بە : (خۆشحاڵ بوون بە ڕۆحی ).

٤٢٨ - أبي عمران الجوني دەربارەی فەرمایشتی : | وَلِتُصنَعَ عَلَى عَيْنِي | (طه : ٣٩).

وتی : (پەروەردە بێت وە گەورە بێت بە بەرچاوی الله عز وجل ەوە ).

٤٢٩ - أبي صالح دەربارەی : فەرمایشتی | مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى | (النجم: ١١).

وتی : (دوو جار بینیویەتی بە دڵی - واتە رسول الله ﷺ، الله عز وجل ی بینیوە - ) .

٤٣٠ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (سێ دانە الله عز وجل سەیریان ناكات لە ڕۆژی قیامەتدا : پێشەوایەكی درۆزن، وە پیرێكی زیناكار، وە فەقیرێكی خۆبەگەورەزان) .

٤٣١ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (الله عز وجل سەیری پیاوێك ناكات كە جووت ببێت لەگەڵ ژنەكەیدا لە دواوەوەی - واتە لە كۆمیەوە - ) .

٤٣٢ - عكرمة وتی : (بەڕاستی الله عز وجل كاتێك بیەوێت بەندەكانی بترسێنێت هەندێكی دەرئەخات بۆ زەوی، جا لەو كاتەدا بومەلەرزە ڕووئەدات، وە كاتێك بیەوێت كە قەومێك لەناو ببات ئەوا خۆی بۆی دەرئەخات) .

٤٣٣ - أبي سعيد الخدري رضي الله عنه فەرمووی وە فەرموودەكەی بەرز ئەكردەوە : (سێ دانە الله تعالى پێئەكەنێت بۆیان : پیاوێك كاتێك هەڵئەستێت لە شەودا نوێژ ئەكات، وە قەومێك كاتێك ڕیز ئەبن بۆ نوێژ، وە قەومێك كاتێك ڕیز ئەبن بۆ شەڕكردن لەگەڵ دوژمن) .

٤٣٤ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەگەر یەكێكتان دای - لە كەسێك - ئەوا با دوور بكەوێتەوە لە ڕووخسار، وە نەڵێت : الله ڕوخسارت ناشرین بكات وە ڕووخساری ئەوەشی لە ڕوخساری تۆ ئەچێت، چونكە الله عز وجل ئادەم ی لەسەر وێنەی خۆی دروستكردووە) .

٤٣٥ - عبدالله بن عباس رضي الله عنه دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : | الر | .

فەرمووی : (من الله م ئەبینم) .

٤٣٦ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (ناشرینی مەدەنە پاڵ ڕووخسار چونكە الله عز وجل ئادەمی لەسەر وێنەی الرحمن تبارك وتعالى دروست كردووە) .

٤٣٧ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (بەڕاستی خۆر و مانگ ناگیرێن بۆ مردنی هیچ كەسێك، بەڵام الله عز وجل كاتێك خۆی دەرخست بۆ شتێك لە دروستكراوەكانی ملكەچ ئەبێت بۆی، جا ئەگەر شتێك لەمەتان بینی دوو ڕكات نوێژ بكەن) .

٤٣٨ - عبدالله بن عمرو رضي الله عنه فەرمووی : (الله عز وجل فریشتەكانی لە نووری هەردوو باسك و سینگ دروستكردووە) .

٤٣٩ - عبيد بن عمير دەربارەی فەرمایشتی الله تعالى : | وَإِنَّ لَهُ عِنْدَنَا لَزُلْفَى | (ص: ٢٥) .

وتی : (نزیك ببەوە، نزیك ببەوە، هەتا شوێنێك الله زاناترە پێی) .

٤٤٠ - عبيد بن عمير وتی : (هەتا بەشێكی لەسەری دائەنێت) .

٤٤١ - إبن عباس رضى الله عنهما فەرمووى : (حەوت ئاسمانەكە و حەوت زەويەكە و وە ئەوەشى كە تياياندايە لە دەستى الله عز وجل دا هيچ نين ئيللا وەك خەردەلێكى بچووك نەبێت لە دەستى يەكێك لە ئێوەدا) .

٤٤٢ - لە أبي مرية، لە أبي موسى رضي الله عنه ـەوە، وە سوننەتەكانيانى فێر ئەكردن، وتى : لە كاتێكدا قسەى بۆ ئەكردن چاوەكانيان لاچوو لەسەرى، فەرمووى : چى چاوەكانى سەرقاڵ كردوون لە من ؟

وتيان : مانگ .

فەرمووى : جا چۆن ئەبێت كاتێك الله عز وجل ئەبينن بە ئاشكرا ؟!) .

---

: واتە مانگ سەرنجى هەمووتانى ڕاكێشا و چاوتان لەسەرم نەما ئەى حاڵتان چۆن ئەبێت ئەگەر لە بەهەشتدا الله عز وجل ببينن ؟

الله تعالى بينينى خۆيمان بە نسيب بكات، آمين .

٤٤٣ - أبي هريرة رضي الله عنه وتى : رسول الله ﷺ فەرمووى : (پەروەردگارمان عز وجل هەموو شەوێک دائەبەزێت كاتێك سێ يەكى كۆتايى شەو ئەمێنێتەوە، ئەفەرمووێت : كێ لێم ئەپاڕێتەوە تا وەڵامى بدەمەوە؟ كێ داواى لێخۆشبوونم لێئەكات تا لێيخۆشبم؟ هەتا فەجر هەڵدێت) .

هەر لەبەر ئەمەش بووە كە كۆتایی شەویان بەلاوە خۆشەویستر بووە وەك لە یەكەمەكەی .

٤٤٤ - شاذ بن یحیى وتی : گوێبیستی یزید بن هارون بووم وتی : (ئەوەی بڵێت قورئان مخلوق ە ئەوە سوێند بە الله ئەوەی كە هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق جگە لە ئەو زەندیقە ) .

٤٤٥ - أبا بكر بن الأسود وتی : گوێم لە عبدالرحمن بن مهدي بوو بە یحیى بن سعید ی ئەوت كە لە سەربانی خانووەكەی بوو : (ئەی باوكی سعید، ئەگەر پیاوێكی جەهمی بمرێت و من میراتگری بوومایە، بە حەڵاڵم نەئەزانی هیچ شتێك لە میراتەكەی ببەم) .

---

: لەبەر ئەوەی جەهمی كافرە و موسوڵمان میرات لە كافر نابات .

٤٤٦ - شاذ بن یحیى وتی : گوێم لە یزید بن هارون بوو و پێی وترا : جەهمیەكان كێن ؟

وتی : ئەوەی پێی وابێت كە | ٱلرَّحۡمَـٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ | پێچەوانەی ئەوەیە كە لە دڵی عەوامی خەڵك جێگیر بووە، ئەوە جەهمیە .

---

**: ئەوەی لە دڵی عەوامی خەڵکی جێگیر بووە کاتێک ئەو ئایەتە ئەخوێننەوە ئەوەیە کە الله لە ئاسمانە لەسەر عەرشەکەی، واتە هەر کەس پێی وابێت الله لەسەر عەرش نییە ئەوە جەهمیە .**

**٤٤٧** - عطاء برازاکەی حجاج الأنماطي وتی : وتم بە مامەم **حجاج** : چی ئەڵێیت دەربارەی قورئان ؟

وتی : (قورئان وتەی الله یە عز وجل، وە هیچ شتێکی الله عز وجل مخلوق نییە ) .

**٤٤٨** - **حماد بن زيد** وتی : (قورئان وتەی الله یە عز وجل، جبريل عليه السلام دایبەزاندووە لە لایەن پەروەردگاری جیهانیان ەوە عز وجل ) .

**٤٤٩** - **قتادة** دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿ **فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ** ﴾ (التين : ٤) .

وتی : (لە جوانترین وێنەدا ) .

**٤٥٠** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (بەڕاستی الله عز وجل جوانە و جوانیشی خۆشئەوێت ) .

٤٥١ - عامر بن سعد البجلي وتی : أبو بكر رضی الله عنه ئەم ئایەتەی خوێندەوە یان خوێندرایەوە لە لای : | لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ | (یونس : ٢٦).

جا فەرمووی : (ئایا ئەزانن | الزِّيَادَةُ | چیە ؟ ڕوانینە بۆ پەروەردگارمان جل ثناؤە).

٤٥٢ - عبد الله بن مسعود رضي الله عنه فەرمووی : (دەنگە دەنگی مێروو ئەبیسترێت لە نێوان چینەكانی پێستی كافر وەك چۆن دەنگە دەنگی دڕندەكان ئەبیسترێت لە وشكانیدا، وە بەڕاستی پێستی ئەو كافرە چل دانە باڵە، بە باڵی الجبار).

٤٥٣ - عبدالله بن مسعود رضي الله عنه فەرمووی : (كاتێك گەیشتمە مەدیەن، پرسیارم كرد دەربارەی ئەو دارەی كە الله عز وجل لەلایەوە قسەی كرد لەگەڵ موسی دا، جا نیشانم درا، هاتمە لای، دارێكی سەوزی گەشاوە بوو، دواتر وشترەكەم لە گەڵاكانی خوارد و جویی، بەڵام نەیتوانی قوتیان بدات بۆیە فڕێیدا، جا صەڵاواتمدا لەسەر پێغەمبەر ﷺ و گەڕامەوە).

٤٥٤ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (بەڕاستی الله عز وجل دائەبەزێتە ئاسمانی دنیا كاتێك سێ یەكی شەوی ئەمێنێتەوە، یان نیوەی شەو، ئەفەرموویت جل ثناؤە : كێ داوای لێخۆشبونم لێئەكات تا لێیخۆشبم ؟ كێ لێم ئەپاڕێتەوە تا وەڵامی بدەمەوە ؟ كێ داوام لێئەكات تا پێی ببەخشم ؟

پاشان دەستی ئەكاتەوە و ئەفەرمووێت : كێ قەرز ئەدات بەوەی نە زوڵم ئەكات وە نە فەقیرە ) .

**٤٥٥** - إبن رواحة بە **حسن البصري** ی وت : (ئایا پەروەردگارت عز وجل وەسف ئەكەیت ؟

فەرمووی : بەڵێ ، وەسفی ئەكەم بەبێ نمونە هێنانەوە ) .

---

**: سەلەف رحمە الله وەسفی الله تعالی یان كردووە بەوەی لە قورئان و فەرموودە و ئاثارەكاندا هاتووە، بەبێ ئەوەی نمونە بۆ سیفەتەكەی الله بهێننەوە و بیچوێنن بە شتێك لە دروستكراوەكانی، چونكە وەك چۆن تەحریف كوفرە بە هەمان شێوە تەشبیهكردنی الله تعالی بە دروستكراوەكانی كوفرە .**

**٤٥٦** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئیماندار غیرە ئەكات ، وە الله عز وجل یش غیرە ئەكات ، وە لە غیرەی الله عز وجل ئەوەیە كە ئیماندار ئەوە ئەنجام بدات كە الله عز وجل حەرامی كردووە لەسەری ) .

**٤٥٧** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (بەڕاستی الله عز وجل سەیری ئەو كەسە ناكات كە بۆ خۆبەگەورەزانین دەرقاچەكەی درێژ ئەكاتەوە و ڕایئەكێشێت ) .

٤٥٨ - مجاهد دەربارەی وتەی الله عز وجل : ﴿وَلَا يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا﴾ (البقرة : ٢٥٥) .

وتی : (توشی قورسی و نارەحەتی ناكات) .

٤٥٩ - عبد الرحمن بن أبي ليلى دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : ( ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ﴾ (يونس : ٢٦) .

وتی : ﴿الْحُسْنَى﴾ بەهەشتە .

﴿وَالزِّيَادَةُ﴾ : ڕوانینیانە بۆ پەروەردگاریان عز وجل .

﴿وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ﴾ (يونس : ٢٦) .

لە دوای ڕوانینیان بۆ پەروەردگاریان عز وجل ) .

٤٦٠ - الحسن البصري دەربارەی فەرمایشتی عز وجل : ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ (القيامة : ٢٣) .

وتی : ﴿نَاضِرَةٌ﴾، جوانە، الله عز وجل جوانی كردووە بە ڕوانین بۆ پەروەردگاری عز وجل، وە حەقی ئەوەی هەیە كە درەوشاوە و جوان ببێت كاتێک سەیری پەروەردگاری دەكات عز وجل ) .

٤٦١ - رسول الله ﷺ فه‌رمووى : (هيچ يه‌كێك له‌ ئێوه‌ نييه‌ ئيللا نيشانى الله عز وجل ئه‌درێت، له‌ نێوان الله و ئه‌ودا هيچ وه‌رگێڕێك نييه‌، به‌ لاى ڕاست و چه‌پدا ڕوو وه‌رئه‌گێڕێت هيچ نابينێت ئيللا ئاگر نه‌بێت، جا هه‌ر يه‌كێك له‌ ئێوه‌ توانى ده‌موچاوى بپارێزێت له‌ ئاگر ئه‌گه‌ر به‌ -به‌خشينى- له‌ته‌ خورمايه‌كيش بێت، ئه‌وا با ئه‌نجامى بدات).

٤٦٢ - ابن عباس رضي الله عنهما ده‌رباره‌ى فه‌رمايشتى | فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ |

فه‌رمووى : (ده‌ركه‌وت وه‌كو په‌نجه‌ توته‌ -واته‌ به‌ ئه‌ندازه‌ى په‌نجه‌ توته‌-).

٤٦٣ - إبن مسعود رضى الله عنه پێش ئه‌وه‌ى قسه‌ بكات سوێندى خوارد و فه‌رمووى : (هيچ يه‌كێك له‌ ئێوه‌ نييه‌ ئيللا په‌روه‌ردگارى له‌گه‌ڵ خۆيدا ته‌نهاى ئه‌كاته‌وه‌ وه‌كو چۆن ته‌نها ئه‌بێته‌وه‌ له‌گه‌ڵ مانگى به‌در.

جا الله عز وجل ئه‌فه‌رمووێت : نه‌وه‌ى ئاده‌م چى بوغراى كردى له‌ من؟ نه‌وه‌ى ئاده‌م چيت وه‌ڵامى نێردراوه‌كان دايه‌وه‌؟ چ كرده‌وه‌يه‌كت ئه‌نجامدا به‌وه‌ى كه‌ زانيت؟).

٤٦٤ - رسول الله ﷺ فه‌رمووى : (فڕێ ئه‌درێته‌ ناو ئاگره‌وه‌، وه‌ -جه‌هه‌ننه‌م- ئه‌ڵێت : ئايا زياتر هه‌يه‌؟

هه‌تا -الله تعالى- پێيه‌كانى له‌سه‌رى دائه‌نێت، جا ده‌ڵێت : به‌سه‌، به‌سه‌).

**٤٦٥** - أبي هريرة رضى الله عنه وتى : (رسول الله ﷺ فەرمووى : ئايا هيچ ئاستەنگ و سەختيەک ديّتە ڕيّتان لە بينينى مانگى شەوى چواردە ؟

وتيان : نەخيّر .

فەرمووى : جا ئيّوە پەروەردگارتان عزوجل ئەبينن وەك چۆن مانگى شەوى چواردە دەبينن، توشى هيچ ئاستەنگ و سەختيەک نابن لە بينينيدا ) .

**٤٦٦** - مجاهد دەربارەى فەرمايشتى عز وجل : | وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ | (القيامة : ٢٢) .

وتى : (بە پيّكەنينەوە | إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ | ) .

**٤٦٧** - عبيد بن عمير وتى : (داود عليه السلام لە ڕۆژى قيامەتدا دلّنيا نابيّت لە هەتا پيّى ئەوتريّت : نزيك بەرەوە .

جا ئەفەرمووێت : تاوانەكەم، تاوانەكەم .

جا دەوتريّت : نزيك بەرەوە .

جا ئەفەرمووێت : تاوانەكەم، تاوانەكەم .

جا پيّى ئەوتريّت : نزيك بەرەوە .

جا ئەفەرمووێت : تاوانەكەم، تاوانەكەم .

هەتا ئەگاتە شويّنيّك الله پيّى زاناترە ) .

سفيان بن عيينة وتی : وەكوو ئەوەی شتێك بگرێت .

٤٦٨ - عبيد بن عمير دەربارەی فەرمايشتی الله عز وجل : | وَإِنَّ لَهُ عِندَنَا لَزُلْفَى | (ص: ٢٥) .

وتی : باسی نزيك بوونەوەی لێی كرد هەتا باسی ئەوەی كرد كە ئەو - واتە پێغەمبەر داود عليه السلام - دەست ئەدات لە هەندێكی - واتە لە هەندێكی الله تعالى - ) .

٤٦٩ - سعيد بن جبير دەربارەی فەرمايشتی الله عز وجل : | وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ | (الحاقة : ١٧) .

وتی : (هەشت ڕيز لە فريشتە) .

٤٧٠ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (هيچ يەكێك نيە بە غيرە تر بێت لە الله عز وجل) .

٤٧١ - وائل بن داود دەربارەی فەرمايشتی الله عز وجل : | وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا | (النساء : ١٦٤) .

وتی : (چەندين جار) .

**٤٧٢** - **جابر بن عبدالله** رضي الله عنها وتی : ده‌شته‌كیه‌ک هات بۆ لای پێغه‌مبه‌ر ﷺ وتی : ڕه‌چه‌ڵه‌كی په‌روه‌ردگاره‌كه‌تمان بۆ باس بكه .

جا الله عز وجل ئه‌مه‌ی دابه‌زاند : | **قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ * اللَّهُ الصَّمَدُ** | هه‌تا كۆتاییه‌كه‌ی .

**٤٧٣** - **محمد بن المنكدر** ده‌رباره‌ی فه‌رمایشتی الله عز وجل : | **قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ * اللَّهُ الصَّمَدُ** | .

وتی : | **الصَّمَدُ** | ئه‌وه‌یه | **لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ * وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ** | .

**٤٧٤** - یحیى بن جعدة وتی : **عمار** وتی : (داوای له ته‌قوا و ترسان له خۆتت لێ ئه‌كه‌م له په‌نهانی و ئاشكرایدا، وه چێژی ڕوانین بۆ ڕووخساری تۆ) .

**٤٧٥** - له **أبي هريرة** ه‌وه رضي الله عنه وتی : عبد الله بن مسعود پێی وتم : (ئه‌ی أبا هريرة ئایا ئه‌زانیت پێستی كافر چه‌نده پان و فراوانه ؟

وتم : نازانم .

وتی : چل دانه باڵه، به باڵی الجبار **- واته الله عز وجل -** ) .

**٤٧٦** - **نيار بن مكرم** وتی : (كاتێك ئه‌مه دابه‌زی : | **الم * غُلِبَتِ الرُّومُ** | (الروم : ٢) .

أبو بكر رضي الله عنه دەرچوو بۆ لای موشریكەكان .

موشریكەكان وتیان : ئەمە وتەی هاوەڵەكەتە .

فەرمووی : (الله عز وجل ئەمەی دابەزاند) .

**٤٧٧** - **إبن عباس** رضي الله عنهما دەربارەی وتەی الله عز وجل : ﴿ **فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا** ﴾ (الأعراف : ١٤٣) .

فەرمووی : (نەبینرا لێی - **واتە لە الله عز وجل** - ئیللا بە ئەندازەی نووكی پەنجە تووتە نەبێت) .

**٤٧٨** - **وكیع** وتی : (هەر كەسێك فەرموودەی : (إسماعیل، لە قیس بن أبي حازم، لە جریر بن عبدالله رضی الله عنه، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەربارەی بینینی الله لە ڕۆژی قیامەت) ڕەتبكاتەوە، ئەوە لە جەهمیەكان هەژماری بكەن).

**٤٧٩** - إسحاق بن بهلول وتی : بە **أبي ضمرة أنس بن عیاض** م وت : نوێژ لە دوای جەهمیەكان بكەم ؟

وتی : (نەخێر، ﴿ **وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ** ﴾ (آل عمران : ٨٥) .

**٤٨٠** - **إبن المبارك** وتی : (جەهمیەكان كافرن) .

٤٨١ - **الحسن بن عيسى** وتی : (کێ گومانی لە کوفری جەهمیەکان هەیە ؟! کێ گومانی لە کوفری جەهمیەکان هەیە ؟!) .

٤٨٢ - **عبدالله بن عمر** وتی : (گوێبیستی حسین بن علی الجعفي بوو، وە فەرموودەی بینینی الله لە ڕۆژی قیامەت ئەگێڕایەوە و وتی : بەکوێرای چاوی جەهم و المريسي) .

٤٨٣ - **ميسرة** دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿**وَقَرَّبْنَاهُ نَجِيًّا**﴾ (مريم : ٥٢) .

وتی : ( - **موسى عليه السلام** - نزيك کرایەوە هەتا گوێی لە دەنگی قەڵەمەکە بوو) .

٤٨٤ - ڕسول الله ﷺ فەرمووی : (**تەرازوو بەدەستی الرحمن ـە عز وجل، خەڵكانێك بەرز ئەكاتەوە و خەڵكانێكی تریش نزم ئەكاتەوە هەتا ڕۆژی قیامەت، وە دڵی مرۆڤەکان لە نێوان دوو پەنجەیە لە پەنجەکانی الرحمن ـە جل وعز، ئەگەر ویستی لێیبێت ڕاگیراوی ئەكات، وە ئەگەر ویستیشی لێیبێت لای ئەدات**).

وە پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو : (**ئەی وەرگێڕی دڵەکان دڵم جێگیر بکە لەسەر دینکەت**) .

٤٨٥ - أبي وائل وتی : (بەندە لە ڕۆژی قیامەت دا ئەهێنرێت الله عز وجل دایئەپۆشێت، وە تاوانەكانی خۆی بۆ باس ئەكات، پاشان لێی خۆش ئەبێت) .

٤٨٦ - أنس بن مالك رضي الله عنه دەربارەی فەرمایشتی : | وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ | (ق : ٣٥) .

فەرمووی : لە هەموو جومعەیەكدا - الله عز وجل- خۆی دەرئەخات بۆیان).

٤٨٧ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (سێ كەس الله عز وجل سەیریان ناكات، وە پاكیان ناكاتەوە، وە سزایەكی پڕ لە ئێشیان بۆ هەیە : پیرێكی زیناكار، وە پاشایەكی درۆزن، وە فەقیرێكی خۆبەگەورەزان) .

٤٨٨ - الضحاك بن مزاحم دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : | وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ | (الزمر : ٦٧) .

وتی : (هەموو ئەوانە لە دەستی ڕاستیدایە) .

٤٨٩ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (بەڕاستی دەججال چاوێكی كوێرە، وە بەڕاستی پەروەردگارتان جل وعز چاوێكی كوێر نییە، لە نێوان چاوەكانی نووسراوە : ك ف ر، هەموو ئیماندارێك ئەیخوێنێتەوە، خوێندەوار و نەخوێندەوار) .

**٤٩٠** - **علي بن أبي طالب** رضي الله عنه فەرمووی : (بەڕاستی دەججال زیان بە ئیماندار ناگەیەنێت، چونکە لە نێوان چاوەکانی نوسراوە : کافر، وە چاوێکی کوێرە، وە بەڕاستی پەروەردگاری ئێوە عز وجل چاوێکی کوێر نییە) .

**٤٩١** - **عبد الله بن عمر** رضي الله عنهما وتی : رسول الله ﷺ هەستا لەناو خەڵکیدا و وەسف و سەنای الله عز وجل ی کرد بەوەی کە شایەنی بوو، پاشان باسی دەججالی کرد و فەرمووی : (من ئاگادارتان ئەکەمەوە لێی، وە هیچ پێغەمبەرێك نەبووە ئیللا قەومەکەی ئاگادار کردووەتەوە، وە نوح علیه السلام قەومەکەی ئاگادار کردووەتەوە، بەڵام من دەربارەی قسەیەکتان پێ ئەڵێم هیچ پێغەمبەرێك نەیوتووە بە قەومەکەی : ئەزانن ئەو چاوێکی کوێرە، وە الله عز وجل چاوێکی کوێر نییە) .

**٤٩٢** - **رسول الله** ﷺ فەرمووی : (الله عز وجل سەیری ئەوە ناکات لە ڕۆژی قیامەت دا کە پۆشاکەکەی درێژکردووەتەوە بە مەبەستی خۆبەگەورەزانی).

**٤٩٣** - **رسول الله** ﷺ فەرمووی : (بەڕاستی الله عز وجل سەیری ڕووخسارتان و سەروەت و سامانتان ناکات، بەڵکو سەیری کردارەکانتان و دڵتان ئەکات) .

## باب : (١٦)

## الرد على الرافضة



(سەرەتای هەموو بیدعەیەک شتێکی کەمە و ماوە ماوە زیاتر دێتە سەری هەتا جاری وا هەیە ئەگات بە کوفر، وە کە گەیشت بە کوفر لەوەندەدا ناوەستێت و بگرە زیاتر ئەبێت، یەکێکی تر لەو بیدعەیانەی سەری هەڵدا کاتێک هاوەڵان رضي الله عنهم لە ژیاندا مابوون بریتی بوو لە بیدعەی شیعەکان، یان ڕافیزەکان، یەکەمجار شیعەکان وتیان ئێمە ئەڵێین لە پاش رسول الله ﷺ أبو بکر باشترینە، لە پاش ئەویش عمر، بەڵام پێشخستن ناکەین لە نێوان عثمان و علي دا، دواتر وتیان علي باشترە لە عثمان، دواتر ئیمامی علي یان پێشخست بەسەر ئیمامی أبو بکر و عمر دا، پاشان چەندین کۆمەڵەیان لێ جیا بوویەوە ئەنواع و ئەشکال بیدعە و کوفریان هێنایە ناو دینەکەیانەوە، هەتا گەیشتوون بەوەی ئیمامی علي بپەرستن لەجیاتی الله و تایبەتمەندیەکانی الله تعالى ی بدەنێ، وە بڵێن جبریل هەڵەی کرد کە وەحی هێنا بۆ محمد ﷺ ئەبوایە بیهێنایە بۆ علي، هەربۆیە وەکو یەهوودیەکان دوژمنی سەرەکیان جبریل یە علیه السلام .

ئەم کۆمەڵە کافرە کوفر و گومڕایی و بیدعە و پۆخڵەواتی وایان هەیە کە لەوانەیە بە مێشکی شەیتانیشدا نەهاتبێت، وە لە هەر پێنج پایەکەی ئیسلام و شەش پایەکەی ئیماندا تووشی کوفر بوون .

خەڵکی ئێستا بە ڕافیزە ئەڵێن شیعە، بەڵام لەلای سەلەف ڕافیزە و شیعە جیاوازن، ئەو کەسانەی کە سەلەف بە شیعە ناویان بردوون بە گشتی تەنها بیدعەیان هەیە و کافر نین، بەڵام ڕافیزەکان پلەیەک لەوان خراپترن و تەکفیرکراون .

شیعەکان زیاتر ئەو کەسانەن کە ئیمامی علي رضي الله عنه پێش ئەخەن بەسەر ئیمامی عثمان رضي الله عنه، یاخود ئەڵێن ئێمە هیچکامیان پێش ناخەین بەسەر ئەویتردا، بەڵام ڕافیزەکان ئەو ئاستەیان تێپەڕاندووە وەک چۆن لە ئەثەرەکاندا دەرئەکەوێت .

لەم بەشەدا ئیمام باسی سەرەتای سەرهەڵدانی شیعەکان ئەکات زیاتر وتەی ئیمامی علي و نەوە و نزیکەکانی بە بەڵگە ئەهێنێتەوە بۆ پووچەڵکردنەوەی عەقیدەی بۆگەنی ڕافیزەکان، ئێمەش پێش دەستپێکردن بە بابەتەکە هەندێک ڕووکردنەوەمان داناوە .

حرب الكرماني ئەڵێت : (الرَّافِضة ئەوانەن کە خۆیان بەریی ئەکەن لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ و جنێویان پێ ئەدەن و کەموکوڕییان لێئەگرن و لە شکۆ و ڕێزیان کەم ئەکەنەوە، وە هەموو ئوممەت تەکفیر ئەکەن ئیللا کەسانێکی کەم نەبێت، وە ڕافیزە هیچ بەشێکیان لە ئیسلامدا نییە) .

**كتاب السنة : ٩٩**

**٧٦٣** - عبدالله بن أحمد ئەڵێت : وتم بە باوكم الرافضة كان كێن ؟

وتی : (ئەوانەی جوێن و قسەی نەشیاو ئەڵێن بە أبو بكر و عمر رحمهما الله) .

**٧٦٤** - أبو بكر المروذي ئەڵێت : پرسیارم كرد لە أبو عبدالله دەربارەی ئەوەی جوێن ئەدات بە أبا بكر و عمر و عائشة ؟

وتی : (واینابینم لەسەر ئیسلام بێت) .

مالک ئەڵێت : (ئەوەی جوێن بدات بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هیچ بەشێكی نییە لە ئیسلامدا) .

**٧٦٥** - الميموني ئەڵێت : گوێم لە أبا عبدالله بوو ئەیوت : (ئەترسم تووشی كوفر بووبن، وەک رافضەكان، هەر كەسێک جوێن بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بدات ئەمین نابین لەوەی لە دین دەرنەچووبێت) .

**٧٦٦** - أبو طالب ئەڵێت كە وتوویەتی بە أبو عبدالله : (كەسێک قسەی ناشرین ئەڵێت بە عثمان بن عفان، هەواڵیان پێ داوم كە كەسێک قسەی پێ وتووە) .وتی : (ئەوە زندیقیەتە) .

**٧٦٧** - عبدالله بن أحمد بن حنبل ئەڵێت : پرسیارم لە باوكم كرد دەربارەی پیاوێک كە قسەی خراپی وتووە بە هاوەڵێكی رسول الله ﷺ .

وتی : (وا نازانم لەسەر ئیسلامەتی مابێت) .

٧٧٩ - موسى بن هارون ئەڵێت : گوێم لە الفريابي بوو کەسێک پرسیاری لێ ئەکرد دەربارەی کەسێک کە قسەی ناشرین ئەڵێت بە أبو بكر ؟

وتی : (کافرە) .

وتی : ئەی نوێژی لەسەر ئەکرێت ؟

وتی : (نەخێر) .

وە پرسیارم لێ کرد : چیی لێ ئەکرێت لە کاتێکدا ئەڵێت لا إله إلا الله ؟

وتی : (دەستی پێوە مەدەن، بە دار بەرزی بکەنەوە هەتا فڕێی ئەدەنە ناو گۆڕەکەی) .

٧٨٠ - أبو عبيد القاسم بن سلام وتی : (لەگەڵ خەڵکیدا ژیام، وە قسەم کرد لەگەڵ ئەهلی کەلام، جا کەسم نەبینی هێندەی رافیضەکان پیس و چەپەڵ و بەڵگەلاواز و گێژ بن، قازیەتی سەنگەرەکانم پێ درا، جا سێ کەسم لەوێ دەرکرد، دوو جەهمی و رافیضیەک، یان دوو رافضی و جەهمیەک، دەرمکردن و وتم کەسی وەکو ئێوە نابێت لەگەل سەنگەرگرەکاندا بێت) .

السنة لـ الخلال



**٤٩٤** - الأسود وتی: لەلای **عائشة** رضي الله عنها باسكرا كە علي رضي الله عنە وەسیەتی بۆ كراوە - **واتە رسول الله ﷺ وەسیەتی بۆ كردووە كە ببێتە خەلیفە** -، وتی: (كەی وەسیەتی بۆ كراوە ؟!

من سەریم نابوو بە سنگمەوە)، یان وتی: (سەری لە كۆشم دا بوو، جا داوای تەشتێكی كرد، جا سوێند بێت لە كۆشمدا ڕۆحی دەرچوو هەستم پێنەكرد ئەو وەفاتی كردووە، جا كەی وەسیەتی بۆ كردووە؟).

---

**: ڕافیزەكان پێیان وایە كە رسول الله ﷺ وەسیەتی كردووە ئیمامی علي لەپاش خۆی ببێت بە خەلیفە، بەڵام هاوەڵان نەیانهێڵاوە ببێت بە خەلیفە، ئەمەش دوورە لە ڕاستیەوە و ئیمام هەر بە وتەی ئیمامی علي و هاوەڵان رضي الله عنهم ئەو بانگەشەیە بەدرۆ ئەخاتەوە.**

**٤٩٥** - **أبو الطفيل عامر بن واثلة** رضي الله عنە فەرمووی: (من لەلای علي بووم رضي الله عنە، پیاوێك هات بۆلای و وتی: پێغەمبەر ﷺ چ نهێنیەكی پێت ڕاگەیاندووە؟

جا توڕەبوو، وە فەرمووی: پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام هیچ شتێكی بە نهێنی پێ ڕانەگەیاندوم كە لە خەڵكی شاردبێتەوە، بێجگە لەوەی كە چوار شتی بۆ باسكردووم.

وتی: ئەوانە چین ئەی ئەمیری ئیمانداران؟

فەرمووی : (لەعنەتی الله لەوەی لەعنەت لە باوکی ئەکات، وە لەعنەتی الله لەوەی سەرئەبڕێت بۆ غەیری الله، وە لەعنەتی الله لەوەی پەنای بیدعەچیەک ئەدات، وە لەعنەتی الله لەوەی منار ی زەوی ئەگۆڕێت) .

---

**: منار واتە نیشانەی سەر زەوی، ئەوە کە خەڵکی زەویەکەی خۆیی پێ جیا ئەکاتەوە لە زەوی خەڵکانی دیکەی نزیک زەویەکەی .**

٤٩٦ - إبراهيم التيمي لە باوکیەوە ئەگێڕێتەوە کە وتی : (علي رضي الله عنە وتاری بۆ داین و شمشیرێکی پێبوو کە لاپەڕەیەکی پێدا هەڵواسرابوو، وتی : والله ی ئێمە هیچ کتێبێک نییە لەلامان بیخوێنینەوە کتێبەکەی الله عز وجل نەبێت، لەگەڵ ئەوەی لەناو ئەم لاپەڕەیەدا نووسراوە، جا لاپەڕەکەی دەرکرد و کردیەوە و ئەوەی تێدا بوو کە ئەڵێت (باسی فەرموودەیەکی رسول الله ﷺ ئەکات لەبارەی هەندێک حوکمەوە) .

---

**: ئیمام ئەم ئەثەرەی بەکارهێناوە بۆ ڕەددانەوەی ڕافیزەکان، ئێمەش بەکاریئەهێنین بۆ ڕەددانەوەی کۆمەڵەیەکی کافر کە لەم سەردەمەی خۆماندا هەن و ناوی خۆیان ناوە قورئانیەکان .**

**قورئانیەکان کۆمەڵەیەکن بناغەی عەقیدەکەیان لەسەر ئەوە دامەزراوە کە فەرموودەی رسول الله ﷺ بە حوججە و بەڵگە نابینن لە دیندا، هەندێکیان بە ڕوون و ئاشکرایی ئەم عەقیدەیە دەرئەخەن و ئەڵێن فەرموودە قبووڵ ناکەین، بەشێکی دیکەشیان**

له ڕووكەشدا خۆیان وا پیشان ئەدەن كە گوایە فەرموودە قبووڵ ئەكەن ئەگەر دژی قورئان نەبێت ! بەڵام لە ڕاستیدا هەردوو كۆمەڵەكە وەكو یەكن.

ئەم كۆمەڵە دێن بە هەوا و ئارەزووی خۆیان تەفسیر بۆ قورئان ئەكەن، پاشان كاتێك فەرموودەیەک ئەبینن كە لەگەڵ هەوا و ئارەزووی خۆیاندا ناگونجێت ئەڵێن ئەمە دژی قورئانە ! بەڵام لە ڕاستیدا فەرموودە دژی قورئان نییە، بەڵكو تێگەیشتنی ئەوان بۆ فەرموودەكە دژی تێگەیشتنیانە بۆ قورئانەكە، ڕوونتری بكەینەوە :

كاتێک فەرموودەیەک ئەبینن بە مێشكی پووچ و هەوا و ئارەزووی خۆیان تەفسیری بۆ ئەكەن، وە كاتێک ئایەتێک ئەبینن بە هەمان شێوە بە مێشكە پووچ و هەوا و ئارەزووی خۆیان تەفسیری بۆ ئەكەن، پاشان ئەڵێن فەرموودەكە دژی قورئانە و لەگەڵیدا ناگونجێت، بەڵام لە ڕاستیدا تێگەیشتنی ئەوان بۆ فەرموودەكە ناگونجێت لەگەڵ تێگەیشتنیان بۆ قورئانەكە.

وەكو ئاماژەمان پێدا قورئانیەكان بە هەموو پۆلەكانیانەوە لەو دوو كۆمەڵەیەدا كۆئەبنەوە، بەڵام لەڕاستیدا هەردوو كۆمەڵەكە هەمان عەقیدەیان هەیە بەڵام هەندێكیان بە ئاشكرا دەریئەبڕن، هەندێكیشیان بە ناڕاستەوخۆ وەک چۆن جەهمیەكان ئەیانوت قورئان مخلوقە، بەڵام پاش ئەوەی كە دەسەڵات لە پشتیان نەما نەیانئەوێرا بە ئاشكرا بڵێن قورئان مخلوقە هەر بۆیە چەند بیدعەیەكی تریان داهێنا بۆ وتنی قورئان مخلوقە، وەكو لفظ ـم بە قورئان مخلوقە، یان ئەڵێم قورئان كەلامی الله یە بەڵام ناڵێم مخلوقە یان غیر مخلوقە.

زۆر ئایەت و فەرموودە و ئاثاری سەلەف هەن كە ڕەددی عەقیدەی قورئانیەكان ئەدەنەوە، بەڵام لێرەدا باسی تەنها یەک ئەثەر ئەكەین كە ڕوونی ئەكاتەوە ئیمام علي لە سەردەمی خۆیدا كاری بە قورئان و فەرموودەی رسول الله ﷺ كردووە : (ئەثەری ٤٩٦ بخوێنەرەوە) .

: تەماشا بكە ئەفەرمووێت (هیچ كتێبێک نییە لەلامان بیخوێنینەوە كتێبەكەی الله عز وجل نەبێت، لەگەڵ ئەوەی لەناو ئەم لاپەڕەیەدا نووسراوە) ئەوە لە لاپەڕەكەدا

نووسراوه فەرمووده‌ی رسول الله ﷺ ـه، لەبەر درێژ نەبوونەوەی بابەتەكە نەمهێناوه ئەتوانن بگەڕێنەوه بۆ سەرچاوەكە.

كەواتە لە سەردەمی هاوەڵە بەرێزەكاندا فەرموودەی رسول الله ﷺ یان نووسیوه و لەبەریان كردووه و كاریان پێ كردووه، لەبەر ئەوەی فەرمووده ڕوونكەرەوەی قورئانه، زۆر شت هەیە لە قورئاندا ناوی بە موجمەلی هاتووه، بەڵام فەرمووده ڕوونی كردووەتەوه، بۆ نمونه نوێژ، چەند ڕكاته؟ كەی ئەنجام ئەدرێت؟ چۆن ئەنجام ئەدرێت؟ ژمارەی ڕكەتەكان چەندە؟ ژمارەی جووڵەی ناو هەر ڕكاتێک چەندە؟ لە هەر ڕكاتێكدا چی ئەڵێیت؟ چەند جار ئەیڵێیت؟ ئەو شتانە چین كە نوێژ بەتاڵ ئەكەنەوه؟ چەند جۆر نوێژ هەیە؟ نوێژی سەفەر چۆنه؟ و . . . چەندین پرسیاری تر كە رسول الله ﷺ بە سوننەتی خۆی ڕوونیكردووەتەوه بۆ هاوەڵان.

ئیمامی الآجري لە كتێبی الشريعة باب ێكی داناوه بە ناوی: (دەروازەی ئاگاداربوون لەو كۆمەڵەیانەی كە سوننەتی رسول الله ﷺ ئەكەن بە گژی كتێبەكەی الله تعالی دا، وه بەریەرچدانەوەیەكی توند بۆ ئەم كۆمەڵەیه).

ئیمام ئەڵێت: پێویستە لەسەر ئەهلی زانست و ژیری هەر كە بیستیان وتەیەكی رسول الله ﷺ كە جێگیر بووه لای زانایان كەسێكی نەزان دژی ئەوەستێتەوه و ئەڵێت: من تەنها ئەوەم قبووڵە كە لە قورئاندا هەیه.

بڵێن: تۆ كەسێكی خراپیت، وه تۆ ئەو كەسەی كە پێغەمبەر ﷺ ئێمەی لێت ئاگاداركردەوه، وه زانایان ئاگاداركردنەوەیان لەبارەی تۆ داوه.

وه بڵێن: ئەی نەزان، الله تعالی فەرزەكانی بەشێوەیەكی گشتی ناردووەتە خوارەوه، وه فەرمانی بە پێغەمبەرەكەی كردووه كە ئەوەیان بۆ ڕوون بكاتەوه كە بۆیان دابەزیوه، الله عز وجل ئەفەرموێت: | وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ | (النحل: ٤٤).

: ئەم قورئانەمان دابەزاندە خوارەوە بۆت هەتا بۆ ئەو خەڵکەی ڕوون بکەیتەوە ئەوەی بۆیان دابەزێنراوە و بەڵکو بیر بکەنەوە.

الله تعالی پێگەی ڕوونکردنەوەی دا بە پێغەمبەرەکەی، وە فەرمانی کرد بە دروستکراوەکان گوێڕایەڵی ببن و نەهی لێکردن لە سەرپێچی کردنی، وە فەرمانی پێ کردن بە گەڕانەوە بۆلای، الله تعالی ئەفەرموویت : | وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا | (الحشر : ٧) .

: وە هەرشتێک پێغەمبەر پێیدان وەری بگرن واتە : بەچی فەرمانی پێکردن بیکەن، وە ڕێی لە هەر شتێک لێگرتن ئێوەش دەستی لێهەڵگرن.

پاشان ئاگاداری کردنەوە لەوەی سەرپێچی فەرمانی رسول الله ﷺ بکەن و الله تعالی فەرمووی : | فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ | (النور : ٦٣)

: ئەوانەی سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەر ئەکەن با بترسن لەوەی تووشی بەڵا و نەهامەتی، یان تووشی سزایەکی بەئێش ببن.

الله عز وجل ئەفەرموویت : | فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا | (النساء : ٦٥)

: سوێند بێت بە پەروەردگارت ئەی پێغەمبەر باوەڕ ناهێنن هەتا بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکانی نێوانیان تۆ نەکەن بە داوەر، وە پاشان بەرامبەر بەو بڕیارەی تۆ داوتە بە هیچ شێوەیەک دڵ تەنگ نەبن و بە چاکیش تەسلیم و ملکەچ ببن.

وە لە قورئانەکەیدا **٣٥** جار گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی ﷺ لەسەر دروستکراوەکانی فەرز کردووە.

وە بە ئەم دژ بەی سوننەتی رسول الله ﷺ ئەوترێت : هەی نەزان الله تعالى ئەفەرمووێت : | وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ | (البقرة : ٤٣)

: وە نوێژ بکەن و ڕۆژوو بگرن.

جا لە کوێی قورئاندا ئەیدۆزیتەوە کە نوێژی بەیانی دوو ڕکاتە ؟ وە نوێژی نیوەڕۆ چوار و، نوێژی عەسر چوار و، نوێژی مەغریب سێ و نوێژی عیشا چوارە ؟ لە کوێی قورئاندا حوکم و کاتەکان و ئەوەی جێگیری ئەکات و ئەوەی هەڵی ئەوەشێنێتەوە ئەدۆزیتەوە تەنها لە سوننەتی رسول الله دا ﷺ نەبێت ؟!

وە بە هەمان شێوە زەکات، لە کوێی قورئاندا ئەیدۆزیتەوە کە لە سەد درهەم پێنج درهەم زەکات ئەدرێت ؟ وە لە بیست دینار نیو دینار و، لە چل مەڕ مەڕێک و هەموو حوکمەکانی زەکات لە کوێی قورئاندا ئەدۆزیتەوە ؟!

وە بە هەمان شێوە تەواوی فەرزەکان دیکە، ئەوەی الله تعالى فەرزی کردووە ناتوانرێت حوکمەکەی بزانرێت تەنها بە سوننەتی رسول الله ﷺ نەبێت، ئەمە وتەی زانایانی موسوڵمانانە، هەر کەسێک شتێکی تر غەیری ئەمە بڵێت ئەوە لە میللەتی ئیسلام دەرچووە و چووەتە ناو میللەتی مولحیدەکان، داوا پاراستن لە الله ئەکەین لە گومڕایی دوای هیدایەت.

وە لە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانیەوە بە هەمان شێوەی ئەوەی من بۆم ڕوونکردوویەتەوە هاتووە، جا ئەوە بزانە) .

٤٩٧ - علي رضي الله فەرمووی : (من پێغەمبەر نیم و وەحیم بۆ نایەت، بەڵام من کار بە کتێبەکەی الله ئەکەم، وە کار بە سوننەتی رسول الله ﷺ ئەکەم

ئەوەندەی توانیم، جا ئەگەر ئەمرم پێ کردن لە گوێڕایەڵیکردنی الله دا ئەبێت گوێڕایەڵم بن ئەگەر پێتان خۆش بێت یان پێتان ناخۆش بێت).

٤٩٨ - **قيس بن عباد** وتی: (وتم بە علي رضي الله عنه: ئایا ئەم ڕۆشتنەت بۆ شەڕ دژی پێچەوانەکەت پەیمانێك بوو رسول الله ﷺ پێی دابوویت یاخود ڕا و بۆچونێك بوو خۆت بینیوتە؟

فەرمووی: (مەبەستت چییە لەو پرسیارە؟).

وتم: دینەکەمان، دینەکەمان.

فەرمووی: (رسول الله ﷺ هیچ پەیمانێکی پێنەداوم دەربارەی، بەڵکو ڕاوبۆچونێك بوو کە بینیومە).

٤٩٩ - **علي** رضي الله عنه فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: (ئەی علي تۆ و دەست و پێوەندەکەت لە بەهەشت دان، وە بەڕاستی قەومێك لەوان نازناوی ناشرینی هەیە پێیان ئەوترێت: الرافضة، ئەگەر پێیان گەیشتیت بیان کوژە چونکە ئەوانە موشریکن).

علي رضي الله عنه فەرمووی: (خۆیان بە خۆشەویستی ئێمە ئەهل و بەیت ئەناسێنن، بەڵام وانین، وە نیشانەی ئەوەش ئەوەیە کە ئەوان قسەی ناشرین یان جنێو ئەدەن بە: أبا بكر و عمر رضي الله عنهما).

٥٠٠ - **عبدالله بن أحمد بن حنبل** ئەڵێت: پرسیارم کرد لە باوکم: الرافضة کێن؟

وتی : (ئەوانەن قسەی ناشرین یان جنێو ئەدەن بە أبا بكر و عمر رضي الله عنهما).

**٥٠١** - **الشعبي** وتی : (ئەگەر شیعەکان لە باڵندە بوونایە ئەوا داڵەکەرخۆرە ئەبوون - **باڵندەیەکە ناسراوە بە گەوجێتی و خیانەتکردن** - .

وە ڕوانیم بۆ ئەم هەوا و ئارەزووانە، وە قسەم لەگەڵ ئەهلەکەیدا کردووە، نەم بینی قەومێك کەم عەقڵتر بێت لە الخشبية - **کۆمەڵەیەکن لە الرافضة** - ).

**٥٠٢** - **علقمة** وتی : (ئەم شیعەیانە زیادەڕەویان کرد لە علي دا رضي الله عنه، هەر وەکو چۆن گاورەکان زیادەڕەویان کرد لە عیسى بن مريم دا عليه السلام).

**٥٠٣** - **الشعبي** وتی : (ئەگەر بمەوێت ئەمماڵەم بۆ پڕ ببێت لە زیو لەسەر ئەوەی درۆیان بۆ بکەم بەدەم علي ـەوە رضي الله عنه ئەوا ئەمکرد، بەڵام والله هەرگیز درۆ ناکەم بە دەمیەوە).

**٥٠٤** - **عامر** وتی : (صعصعة بن صوحان وتاری، دا، جا باسی دروستکردنی ئادەم عليه السلام و ئوممەتەکان و جاهیلیەت و ناردنی پێغەمبەر ﷺ ی کرد .

پاشان وتی : پێغەمبەر ﷺ مرد و الله عز وجل أبا بكر ی رضي الله عنه کرد بە جێنشین، جا کاری بە قورئان کرد، وە بڕیاری دا لە الكلالة دا، ، پاشان أبو بكر مرد؛ ڕەحمەتی الله لە أبا بكر بێت، دواتر عمر رضي الله عنه بوو بە

جێنشین، جا موچەی بڕیەوە، وە تۆماری دانا، وە شارەكانی بنیادنا، پاشان عمر كوژرا، الله ڕەحم بە عمر بكات، دواتر خەڵكی عثمان یان رضي الله عنه كرد بە جێنشین ) .

٥٠٥ - مضارب بن حزن وتی : وترا بە علي بن أبي طالب رضي الله عنه : چی پاڵی پێوەنان - واتە خەواریجەكان - عثمان رضي الله عنه بكوژن ؟

فەرمووی : (حەسوودی ) .

٥٠٦ - كثير أبو إسماعیل النواء وتی : پرسیارم كرد لە زید بن علي - نەوەی ئیمامی علي - دەربارەی : أبي بكر و عمر رضي الله عنهما ؟

وتی : خۆشیانت بوێ ) .

وتم : چی ئەڵێیت دەربارەی ئەو كەسەی خۆی لێیان بەری ئەكات ؟

وتی : (خۆی لێ بەری ئەكرێت هەتا تەوبە ئەكات ) .

٥٠٧ - جعفر بن محمد - نەوەی ئیمامی علي - وتی : (الله عز وجل بەریە لەو كەسەی خۆی بەری ئەكات لە أبي بكر و عمر رضي الله عنهما ) .

٥٠٨ - سالم بن أبي حفضة وتی : پرسیارم كرد لە أبا جعفر و جعفر دەربارەی : أبي بكر و عمر رضي الله عنهما ؟

وتیان : (ئەی سالم خۆشیانت بوێ، وە خۆت بەری بكە لە دوژمنەكەیان، چونكە ئەو دووانە دوو ئیمامی هیدایەت بوون ) .

وه جعفر پێی وتم : ئەی سالم، أبو بكر باپیرەمە، ئایا پیاو جنێو بە باپیرەی ئەدات ؟!

شەفاعەتی محمد ﷺ نەمگرێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەگەر خۆشم نەوێن و خۆم بەری نەکەم لە دوژمنەکەیان ) .

---

**: ئەم دوو ئەثەرە و چەندین ئەثەری تریش شایەتی بۆ ئەوە ئەدەن کە عەقیدەی رافیزە بۆگەنەکان لەناو نەوەکانی ئیمامی علي ـدا رضي الله عنه نەبووە، بەڵکو ئەوە درۆیەکە ڕافیزە درۆزنەکان بۆ ڕەواجدان بە عەقیدەکەی خۆیان هەڵیانبەستووە، وە ئەثەرەکانی دواتریش شایەتی بۆ ئەوە ئەدەن کە ئیمامی علي رضي الله عنه بەبێ جیاوازی ڕێزی لە هەموو هاوەڵان رضي الله عنهم گرتووە، وە بە تایبەتی پێگەی سێ خەلیفەکەی پێش خۆیی بە بەرزی ڕاگرتووە .**

٥٠٩ - **سالم** وتی : یەکێك لە پیاوە گەورەکانی نەسرانیەکان - کە پێشتر عمر رضي الله عنه دەری کردبوون لە زەویەکانیاندا - هات بۆ لای علي رضي الله عنه وتی : ئەی ئەمیری ئیمانداران سوێندت ئەدەم بە کتابەکەت بە دەستی ڕاستت، وە شەفاعەتەکەت بە زمانت بمانگێڕەوە بۆ زەویەکانمان .

فەرمووی : نەخێر، بەڕاستی عمر رضي الله عنه کارەکانی هەمووی ڕاست بوون) .

٥١٠ - **علي** رضي الله عنه وتی : گوێم لە رسول الله بوو ﷺ فەرمووی : (طلحة و الزبير هەردووكیان دراوسێمن لە بەهەشتدا) .

٥١١ - علي رضي الله عنه فەرمووی : (هیچ كەسێك نییە فەزڵم بدات بەسەر أبي بكر و عمر دا رضي الله عنهما ئیللا جەڵدی ئەكەم بە حەددی بوختانكەر) .

٥١٢ - أبي الجلاس وتی : گوێم لە علي بوو رضي الله عنه بە عبد الله بن سبأ ی وت : (تیاچوون بۆ تۆ، رسول الله ﷺ هیچ شتێكی بۆ ئاشكرا نەكردووم كە شاردبێتیەوە لە یەكێك لە خەڵكی، بەڵام بیستم لێی فەرمووی : بەڕاستی پێش قیامەت سی درۆزن هەیە، تۆ یەكێك لەوانەیت) .

---

: عبدالله بن سبأ ئەو یەهودیە پیسە بوو كە كۆمەڵێک لە خەڵكی دژی ئیمامی عثمان رضي الله عنه هاندا هەتا شەهیدیان كرد بە زوڵملێكراوی، وە لەپاڵ ئەوەشدا بەدرۆوە خۆی ئەدایە پاڵ خۆشویستنی ئیمامی علي رضي الله عنه .

لە خەلافەتی ئیمام عثمان بن عفان دا موسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند و خۆی دایە پاڵ خۆشویستنی ئیمامی علي، وە لەناخەوە زۆر دژی ئیسلام بوو، ئەیویست وەک چۆن پۆلس ی یەهوودی دینی مەسیحیەكانی تێكدا و عیسی ی علیه السلام كرد بە خوا ئەمیش دینی ئیسلام تێكبدات و ئیمامی علي بكەن بە خوا، شوێنكەوتووەكانی عبدالله بن سبأ لعنهم الله تعالی پێیان ئەوترێت (السبئية) یان (علي الإلهية) علي رضي الله عنه ئەپەرستن .

٥١٣ - محمد بن علي ابن الحنفية وتی : وتم بە باوكم - علي رضي الله عنه - : كام كەسە باشترە لە دوای رسول الله ﷺ ؟

فەرمووی : أبو بكر .

وتم : پاشان کێ ؟

فەرمووی : عمر .

وتی : پاشان دەست پێشخەریم کرد و ترسام کە پرسیاری لێبکەم و وەڵامم بداتەوە بە غەیری ئەوە و وتم : پاشان تۆ ؟

فەرمووی : نەخێر، من پیاوێکم لە خەڵکی، چاکە و خراپەم هەیە، الله ئەوەی ویستی لێیبێت ئەیکات ) .

٥١٤ - علي رضي الله عنه کاتێک تەواو بوو لە شەڕی الجمل وتاری دا و فەرمووی : (بەڕاستی رسول الله ﷺ هیچ پەیمانێکی نەداوە بە ئێمە دەستی پێوە بگرین لەم ویلایەتە دا، بەڵکو شتێکە لەلایەن خۆمانەوە بینومانە، جا ئەگەر ڕاست بوو ئەوە لەلایەن الله عز وجل ەوەیە، وە ئەگەر هەڵە بوو ئەوە لەلایەن نەفسی خۆمانەوەیە، أبو بكر رضي الله عنه بوو بە گەورە و کاربەدەستمان، جا هەستا و جێبەجێی کرد و جێگیر بوو، هەتا ڕۆیشت بەڕێگای خۆیدا ڕەحمەتی الله ی لێبێت، پاشان عمر رضي الله عنه لەدوای ئەو بوو بە گەورە و کاربەدەستمان، جا هەستا و جێبەجێی کرد و جێگیر بوو، هەتاوەکو ئیسلامی جێگیر و ڕاگیراو و قایم کرد، پاشان ڕۆیشت ڕەحمەتی الله ی لێ بێت ) .

٥١٥ - علي رضي الله عنه فەرمووی : (کەسانێك منیان خۆش ئەوێت هەتا بەهۆی خۆشەویستی منەوە ئەچنە ئاگرەوە، وە کەسانێك ڕقیان لە من ئەبێتەوە هەتا بەهۆی ڕق لێبونەوەیان لە من ئەچنە ئاگرەوە ) .

**٥١٦** - الشعبي وتی : گەشتم بە **علقمة** وتی : ئایا ئەزانیت نمونەی علي رضي الله عنه لەم ئوممەتەدا وەك چیە ؟

وتم : نمونەی وەك چیە ؟

وتی : (نمونەی وەكو عیسی بن مریم ـە علیه السلام؛ كەسانێك خۆشیان ویست هەتا تیاچوون بەهۆی خۆشەویستی ئەوەوە، وە كەسانێكیش ڕقیان لێی بوەوە هەتا تیاچوون بەهۆی ڕقلێبوونیەوە) .

**٥١٧** - لەلای **إبن أبي ليلى** باسی وتەی خەڵكیان كرد لەلای دەربارەی علي رضي الله عنه، جا وتی : باسی : دانیشتووین لەگەڵیدا و قسەمان لەگەڵدا كردووە وە خواردومانە و خواردومانەتەوە لەگەڵیدا، وە هەستاوین بە ئەنجامدانی كارەكان بۆی، وە نەمانبیستوە لێی شتێك بڵێت لەوەی كە ئێوە ئەیڵێن، ئایا بەس نیە بۆتان بڵێن : ئامۆزای رسول الله یە ﷺ، وە زاوایەتی، وە ئامادەی بەیعەتی الرضوان بووە، وە ئامادەی جەنگی بەدر بووە) .

**٥١٨** - **علي** رضي الله عنه فەرمووی : (سوێند بە الله دەربارەی ئێمەدابەزی : ﴿ **وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِمْ مِنْ غِلٍّ إِخْوَانًا عَلَى سُرُرٍ مُتَقَابِلِينَ** ﴾ (الحجر: ٤٧) .

## باب : (١٧)

## باسی پێشەواکان و خەلافەت و پێشخستن لە نێوانیاندا



(لەم بەشەدا ئیمام باسی پێشخستنی چوار خەلیفە ڕاشیدەکە وەکو پێگە و فەزڵ، وە وەکو خەلافەت ئەکات، وە ئاماژە بەو بەڵگەیانە ئەکات کە ئیمامی أحمد رحمه الله بەکاریهێناوە بۆ پێشخستنی هەندێک هاوەڵ بەسەر هەندێکی تردا .

وە تێیدا ڕەددی ئەو کەسانە ئەداتەوە کە ئیمامی علي یان رضي الله عنه بە خەلیفەی چوارەم دانەناوە .



**٥١٩ - عبدالله بن أحمد بن حنبل** ئەڵێت : پرسیارم کرد لە باوکم دەربارەی ئیمامەکان ؟

وتی : (أبو بكر، پاشان عمر، پاشان عثمان، پاشان علي لە خەلیفەکاندا) .

٥٢٠ - وە وتی : گوێبیستی باوکم بووم وتی : سەبارەت بە پێشخستن ئەڵێم : (أبو بكر، پاشان عمر، پاشان عثمان، پاشان علي) .

وتەی إبن عمر رضي الله عنهما : ئێمە ئەمانژمارد وە رسول الله ﷺ زیندوو بوو، ئەمانوت : (أبو بكر و عمر و عثمان) .

وە علي لە خەلیفەکاندا .

٥٢١ - وە وتی : گوێم لێبوو باوکم وتی : (خیلافەت لەسەر ئەوەیە کە سفینة رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ : (خیلافەت لەم ئومەتەی مندا سی ساڵە) .

وە ئێمە کار بە هەردوو هەواڵەکە ئەکەین : ئەوەی سفینة فەرمووی، وە ئەوەشی کە إبن عمر فەرمووی .

وە ئەو کەسە عەیبدار ناکەین کە علي ئەکاتە چوارەمیان بەهۆی نزیکیایەتیەکەی و زاوایەتیەکەی و زوو موسڵمان بوونی و دادپەروەرەیەکەی، وە ئەو هاوەڵانەی رسول الله ﷺ کە لەگەڵیدا بوون ناویان نابوو : ئەمیری ئیمانداران، وە حەددەکانی جێبەجێ ئەکرد و ڕەجمی ئەکرد و حەجی ئەکرد بە خەڵکی، وە بانگ ئەکرا بە : ئەمیری ئیمانداران) .

٥٢٢ - وە وتی : پرسیارم کرد لە باوکم رحمه الله : دەربارەی پێشخستنی نێوان أبي بكر و عمر و عثمان و علي رضوان الله عليهم ؟

وتی : (أبو بكر و عمر و عثمان، وە علي چوارەمە لە ناو خەلیفەکاندا) .

وتم بە باوكم : كەسانێك ئەڵێن : ئەو - واتە علي - خەلیفە نییە ؟!

وتی : (ئەمە وتەیەكی خراپ و پیسە، هاوەڵانی رسول الله ﷺ پێیان ئەوت : ئەی ئەمیری ئیمانداران، ئایا بە درۆیان ئەخەنەوە ؟ وە حەجی كردووە و دەستی دزی بڕیوە و ڕەجمی زیناكاری كردووە، جا ئەمە ئەبێت ئیللا بۆ خەلیفە نەبێت ؟!) .

---

**: مەزهەبی ئیمام أحمد بن حنبل دەربارەی التفضيل و خەلافەت بەم جۆرەیە:**

**باشترین كەسی ئەم ئوممەتە دوای پێغەمبەر ﷺ ابو بكرە، پاشان عمر، پاشان عثمان .**

**لەسەر فەرموودەكەی ابن عمر ئەڕوات كە ئەڵێ: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ كەسمان لە ابو بكر بە باشتر نەئەزانی پاشان عمر پاشان عثمان، پاشان هاوەڵانی پێغەمبەرمان واز لێ ئەهێنا تەفزیلمان نەئەكردن بەسەر یەكتردا.**

**بەڵام لێی ریوایەت كراوە لە هەندێک شوێن دوای عثمان ئەڵێ علي، وە ئەڵێ ئەوانەی دوای عثمان ئەڵێن علي ووتەكەیان ڕەت ناكەمەوە، ئەوەی بڵێ ابو بكر پاشان عمر پاشان عثمان سەوابە، وە ئەوەی بڵێ ابو بكر پاشان عمر پاشان عثمان پاشان علي ئەویش سەوابە، بەڵام من لەسەر فەرموودەكەی ابن عمر م**

**وە كاتێک ئەهلی شام پرسیاری تەفزیلی لێ ئەكەن لە چوارەم ناوی علي ئەهێنێت، ئەمەش بۆ ئەوە ئەگەڕێتەوە ئەهلی شام بەنی ئومەییە حوكمی كردوون و شام شوێنی سەرەكیان بووە و پایتەخی خیلافەت لەوێ بووە، ئیمام عثمانیش لە بەنی ئومەییە یە، هەروەها بەهۆی خیلافی نێوان علي و معاوية رضي الله عنهما ناصبی بوون لەناو ئەهلی شام سەری هەڵدا كە ڕق بوونەوە بوو لە ئەهلی بەیت، بۆیە ئیمام احمد لە وەڵامی خەڵكی شام ناوی علي ئەهێنێت دوای عثمان لە تەفزیل كردن، ئەگینا ئەوەی لە ئیمام احمدەوە**

مەشهورە ڕۆیشتنە لەسەر فەرموودەکەی ابن عمر لە عثمان ئەوەستێ لە تەفزیل کردن، کێشەشی نیە دوای عثمان بووترێ علي، هەروەک الخلال یش باسی ئەمەی کردووە .

وە بەشێکی دیار لە سەلەف لە تەفزیل کردندا علي ئەکەن بە چوارەم، بەڵام ئەوەی مەبەستمانە لێرەدا روونکردنەوەی مەزهەبی ئیمام احمدە لە تەفزیل کردن کە لەسەر چی بووە .

سەبارەت بە خیلافەتیش ئیمام احمد لەسەر فەرموودەی سفینة ئەڕوات کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (خیلافەت ٣٠ ساڵ ئەبێت) .

٢ ساڵ ابو بکر

١٠ ساڵ عمر

١٢ ساڵ عثمان

٦ ساڵ علي

خەلیفەی یەکەم ابو بکرە، هی دووەم عمر، هی سێیەم عثمان، هی چوارەم علي.

پوختەی مەزهەبەکەی بەم جۆرەیە:

لە تەفزیل کردندا: ابو بکر پاشان عمر پاشان عثمان رضي الله عنهم أجمعين .

لە خیلافەتدا: ابو بکر پاشان عمر پاشان عثمان پاشان علي رضي الله عنهم أجمعين .

٥٢٣ - إبن عمر رضي الله عنه فەرمووی : (ئێمە لەسەردەمی رسول الله ﷺ ئەمانوت کە باشترینی ئەم ئوممەتە لەدوای پێغەمبەرەکەی ﷺ أبو بکر ە، پاشان عمر، پاشان عثمان رحمة الله عليهم) .

٥٢٤ - عبد الرحمن بن أبي ليلى وتى : (عمر بن الخطاب وتارى دا، سوپاس و ستايشى الله ى كرد و وەسفى كرد، پاشان فەرمووى : ئاگاداربن باشترينى ئەم ئوممەتە لەدواى رسول الله ﷺ أبو بكر ە، هەر كەسێك لەدواى ئەم هەڵوێستەمەوە شتێكى تر بڵێت ئەوە بوختان كارە، وە ئەو حەددەى لەسەرە كە بۆ كەسى بوختانكار هەيە) .

٥٢٥ - رسول الله ﷺ فەرمووى : (شوێن ئەو دووانە بكەون لەدواى من : أبو بكر و عمر رضي الله عنهما) .

٥٢٦ - مسروق وتى : (خۆشەويستى أبي بكر و عمر و زانينى پێگە و گەورەييان لە سوننەتەوەيە) .

٥٢٧ - حذيفة رضي الله عنه وتى : رسول الله ﷺ فەرمووى : (شوێن ئەو دووانە بكەون لەدواى من) .

ئاماژەى كرد بۆ أبي بكر و عمر .

(وە ڕێچكەى عمار بگرنەبەر، وە دەستبگرن بە پەيمانى إبن أم عبد - واتە دەستبگرن ئامۆژگارى و وتەكانى عبد الله بن مسعود رضي الله عنه - ) .

٥٢٨ - علي رضي الله عنه فەرمووى : (باشترينى ئەم ئوممەتە لەدواى پێغەمبەرەكەى ﷺ : أبو بكر ە، وە باشترينى لەدواى أبي بكر : عمر ە، وە ئەگەر بمويستايە ئەمتوانى ناوى سێيەميان بهێنم) .

٥٢٩ - وهب السوائي وتى : علي رضي الله عنه وتارى بۆ داين ، وتى : (كێ باشترينى ئەم ئوممەتەيە لەدواى پێغەمبەرەكەى ﷺ؟) .

وتمان : تۆ ئەى ئەميرى ئيمانداران .

وتى : (نەخێر ، باشترينى ئەم ئوممەتە لە دواى پێغەمبەرەكەى ﷺ أبو بكر ـە ، پاشان عمر) .

٥٣٠ - أبي جحيفة ئەڵێت : من وام ئەبينى كە علي رضي الله عنه باشترينى خەڵكيە لەدواى رسول الله ﷺ ، وتم : ئەى ئەميرى ئيمانداران ؛ من واى نابينم هيچ يەكێك لە موسڵمانان لە دواى رسول الله ﷺ باشتر بێت لە تۆ .

وتى : (ئەى أبا جحيفة ئايا پێت نەڵێم كێ لەدواى رسول الله ﷺ باشترين كەسە ؟) .

وتم : بەڵێ .

وتى : (أبو بكر ـە رضي الله عنه) .

وتى : (ئايا هەواڵت پێنەدەم بە باشترينى خەڵكى لەدواى رسول الله ﷺ و أبو بكر رضي الله عنه ؟) .

وتم : بەڵێ ، بە فيدات بم .

وتى : (عمر رضي الله عنه) .

**٥٣١ - الحارث** وتی : علي رضي الله عنه كاتێك بچوایەتە سەر مینبەر سەلامی ئەكرد و ئەیفەرموو : (ئەی خەڵكینە ئەوەی كە پێتان ئەڵێم : الله عز وجل فەرمووی، یان رسول الله ﷺ فەرمووی، یان لە كتێبی الله عز وجل ـدا بوو، ئەوا پەیوەستبن پێوەی؛ سوێند بە الله ئەگەر لە ئاسمانەوە بخرێمە خوارەوە و باڵندەكان بمفرێنن و پارچە پارچەم بكەن یان بایەكی بەهێز بمبات بۆ جێگایەكی دوور، پێمخۆشترە لەوەی كە درۆ هەڵبەستم بۆ الله عز وجل، یان بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ، یاخود بۆ كتێبەكەی .

وە هەر شتێك لە نەفسی خۆمەوە پێم وتن پیایدا بچنەوە، باشترینی ئەم ئوممەتە لەدوای پێغەمبەرەكەی ﷺ : أبو بكر ـە، وە لەدوای أبي بكر : عمر ـە، وە سێیەمیان ئەگەر بمویستایە ئەوا ناوم ئەبرد) .

دواتر وتاری دا .

**٥٣٢ - إبراهيم النخعي** وتی : علقمة كێشای بەم مینبەرەدا و وتی : علي رضي الله وتاری بۆ داین لەسەر ئەم مینبەرە، سوپاس و ستایشی الله ی كرد، پاشان یادی الله ی كرد ئەوەندەی الله ویستی لێبوو یاد بكرێت، دواتر فەرمووی : (ئاگاداربن كە من پێم گەیشتووەتەوە كەسانێك فەزڵم ئەدەن بەسەر أبي بكر و عمر ـدا رضي الله عنهما، ئەگەر بێتو لەو بابەتەدا پێشوەختە ئاگادارم كردباناتانەوە ئەوە سزام ئەدان، بەڵام من ڕقم لە سزادانە ئاگادار كردنەوە، هەر كەسێك شتێك لەمەدا بڵێت ئەوا بوختانكەرە، ئەو حەددەی لەسەرە كە لەسەر كەسی بوختانكەر هەیە، باشترینی خەڵكی لە دوای رسول الله ﷺ : أبو بكر ـە، پاشان عمر) .

**٥٣٣ - قيس بن عباد** وتی : علي رضي الله عنه لە ڕۆژی الجمل دا بە کوڕەکەی فەرموو : (ئەی حسن، بریا باوکت بیست ساڵ پێش ئێستا ئەمرد) .

الحسن پێی وت : ئەی باوکە من ڕێگریم لێ کردیت لەمە .

فەرمووی : (ئەی کوڕەکەم من وام نەئەبینی کارەکە بگات بەمە) .

**٥٣٤ - عبدالله بن أحمد بن حنبل** ئەڵێت : بیستم باوکم رحمه الله وتی : سوننەت لە التفضيل دا، ئەوەی کە بۆچوومانە ئەوەیە کە ڕیوایەت کراوە لە إبن عمر ـەوە رضي الله عنه ئەیفەرموو : (أبو بكر، پاشان عمر، پاشان عثمان رضي الله عنهم) .

سەبارەت بە خیلافەت : (فەرموودەکەی سفينة بۆچوونمانە، ئەڵێین : أبو بكر و عمر و عثمان و علي رضي الله عنهم لە خەلیفایەتیدا) .

کار بە هەردوو فەرموودەکە ئەکەین، وە ئەو کەسە عەیبدار ناکەین کە علي ئەکاتە چوارەمیان بەهۆی نزیکیایەتیەکەی و زاوایەتیەکەی و زوو موسڵمان بوونی و دادپەروەرەیەکەی) .

**٥٣٥ - سفينة أبي عبد الرحمن** رضي الله عنه وتی : گوێبیستی رسول الله بوو ﷺ فەرمووی : (خیلافەت سی دانە ساڵە، پاشان لەدوای ئەوە ئەبێتە پاشایەتی) .

سفينة رضي الله عنه فەرمووی : (دەست بگرە بە : دوو ساڵەكەی أبي بكر و دە ساڵەكەی عمر و دوانزە ساڵەكەی عثمان و شەش ساڵەكەی علي رضي الله عنهم).

**٥٣٦ - سفينة** مولی ی رسول الله ﷺ وتی : رسول الله ﷺ فەرمووی : (خەلافەت لە دوای من سی ساڵە) .

سفينة رضي الله عنه وتی : علي رضي الله عنه سی ـەكەی تەواو كرد .

**٥٣٧ - عائشة** رضي الله عنها وتی : (كاتێك رسول الله ﷺ مزگەوتی مەدینەی دروستكرد، پێغەمبەر ﷺ بەردێكی هێنا و داینا، پاشان أبو بكر رضي الله عنه بەردێكی هێنا و داینا، پاشان عمر رضي الله عنه بەردێكی هێنا و داینا، پاشان عثمان رضي الله عنه بەردێكی هێنا و داینا .

پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (ئەوانە كاربەدەستانی خەلافەتن لە دوای من) .

## باب : (١٨)

## پرسیاری لێكرا دەربارەی سزای گۆڕ و تاقیكردنەوەی گۆڕ



(باوەڕبوون بە (سزا و تاقیكردنەوەی گۆڕ) یەكێكە لە بنچینەكانی عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە، چەندین فەرموودەی صریح و صحیح دەربارەی هاتووە، وە ئیمامەكانی سەلەف رحمهم الله چەندین ئیجماع نقڵ ئەكەن لەسەری، بەڵام موعتەزیلەكان لە كۆن و قورئانیەكان لە ئێستادا سزای گۆڕ ڕەت ئەكەنەوە و ئەڵێن گوایە بە مێشكە پووچەكەیاندا ناچێت و چەندین فەرموودەی رسول الله ﷺ و تەفسیری سەلەف ڕەت ئەكەنەوە .

- أحمد بن حنبل (**٢٤١** هـ) ئەڵێت : (سزای گۆڕ حەق و ڕاستیە، كەس ڕەتی ناكاتەوە ئیللا گومڕایەكی گومڕاكار نەبێت) .

**طبقات الحنابلة : (١/١٤٩)**

- علي بن المديني (**٢٣٤** هـ) باسی عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەكات و ئەڵێت : (وە ئیمان هێنان بە سزای گۆڕ : ئەم ئوممەتە تاقی ئەكرێنەوە لە گۆڕەكانیان، وە پرسیاریان لێئەكرێت دەربارەی پێغەمبەر ﷺ، وە منكر و نكير دێنە لایان هەرچۆنێک كە الله تعالى ویستی لێبێت، وە بە هەرشێوەیەک كە الله تعالى بیەوێت، ئەبێت ئیمانت پێی هەبێت و بەڕاستی بزانیت) .

عقيدة علي بن المديني : (٨)

- عبدالملك بن حبيب المالكي (٢٣٨ هـ) باسی عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەكات و ئەڵێت : (تاقیكردنەوە و سزای گۆڕ لای ئەهلی سوننە و ئیمان هێنان بە الله بەهێزە و هیچ گومانێكیان لێیان نیە، هەر كەس بە درۆی خستەوە ئەوە لە ئەهلی بە درۆخستنەوەی الله یە، زەندیقەكانیش بە درۆی دەخەنەوە ئەوانەی باوەڕیان بە زیندووبوونەوە نیە، سوچێك وتەكانیان دەركەوت و بینیم بڵاوبووەتەوە لە ناو خەڵكیدا، منیش ترسام لەوەی گومڕا ببن لە دین و ئیمانیان، بۆیە ئاگاداریان بن، چونكە ئەوانەن كە وتیان: ڕۆحەكان دەمرن بە مردنی جەستە بە مەبەستی بە درۆخستنەوەی سزای گۆڕ و ئەوەی دوای خۆی وایان وت) .

أصول السنة لـ إبن أبي زمنين : (٨٨)

- أبو حاتم (٢٧٧ هـ) و أبو زرعة (٢٦٤ هـ) باسی عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەكەن و ئەڵێن : (وە سزای گۆڕ حەق و ڕاستیە) .

عقيدة الرازيين : (١٥)

- أبو عوانة الإسفراييني الشافعي (٣١٦ هـ) باسی عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەكات و ئەڵێت : (وە ئیمان هەبوون بەوەی سزای ناو گۆڕ حەق و ڕاستە) .

عقيدة أبو عوانة الإسفراييني : (٢٤)

- أبي عبدالله الزبيري الشافعي (١٣٨ هـ) باسی عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەكات و ئەڵێت : (الله تبارك وتعالى دەفەرمووێ : ﴿فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ﴾ [طه : ١٢٤] .

موفەسیرەكان ئەڵێن : ئەوە سزای ناو گۆڕە .

٤٦ - وە لەبەر وتەكەی الله عزَّوَجَل : ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْءَاخِرَةِ﴾ [إبراهيم : ٢٧] .

موفەسیرەكان ئەڵێن : ئەوە لە گۆڕدایە .

٤٧ - وە ووتەی الله عزَّوَجَل : ﴿ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا ۖ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓا۟ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ﴾ [غافِر : ٤٦] .

٤٨ - وە رسول الله ﷺ پەنای ئەگرت بە الله عزَّوَجَل لە سزای گۆڕ .

عقيدة أبي عبدالله الزبيري الشافعي

- أبو الفتح المقدسي الشافعي (٤٧١ هـ) باسی عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەكات و ئەڵێت : (سزای ناو گۆڕ حەق و ڕاستیە) .

عقيدة أبو الفتح المقدسي : (٢٠)



**٥٣٨** - **عائشة** رضي الله عنها وتى كه‌ ئافره‌تێكى جوله‌كه‌ هاتووه‌ته‌ ماڵه‌وه‌ بۆلاى، داواى بۆنێكى خۆشى لێكرد، دواتر عائشة پێى به‌خشى، ئافره‌ته‌ جوله‌كه‌كه‌ وتى : الله بتپارێزێت له‌ عه‌زابى قه‌بر .

عائشة رضي الله عنه وتى : به‌هۆى ئه‌مه‌وه‌ شتێك كه‌وته‌ دڵمه‌وه‌، هه‌تا رسول الله ﷺ هاته‌وه‌ جا باسى ئه‌وه‌م بۆ كرد، وتم : ئه‌ى رسول الله قه‌بر عه‌زابى هه‌يه‌ ؟!

فه‌رمووى : (به‌ڵێ، ئه‌وان سزا ئه‌درێن له‌ قه‌بره‌كانياندا به‌ سزايه‌ک كه‌ گيانداره‌كان ئه‌يبيستن) .

**٥٣٩** - رسول الله ﷺ فه‌رمووى : (به‌ڕاستى قه‌بر گوشينى هه‌يه‌، ئه‌گه‌ر كه‌سێك هه‌بووايه‌ ڕزگارى ببوايه‌ لێى ئه‌وا سعد بن معاذ ڕزگارى ئه‌بوو لێى) .

**٥٤٠** - رسول الله ﷺ فه‌رمووى : (ئه‌ى په‌روه‌ردگارم من په‌نات پێ ئه‌گرم له‌ سزاى ئاگرى دۆزه‌خ، وه‌ له‌ تاقيكردنه‌وه‌ى ئاگرى دۆزه‌خ، وه‌ تاقيكردنه‌وه‌ى گۆڕ، وه‌ سزاى گۆڕ . . . ) .

**٥٤١** - رسول الله ﷺ فه‌رمووى : (كاتێك يه‌كێك له‌ ئێوه‌ چووه‌ ته‌حياته‌وه‌ با په‌نا بگرێت به‌ الله له‌ چوار شت، با بڵێت : ئه‌ى په‌روه‌ردگارم په‌نات پێ ئه‌گرم له‌ سزاى جه‌هه‌ننه‌م، وه‌ سزاى گۆڕ، وه‌ خراپه‌ى فيتنه‌ى مه‌سيحى ده‌جال، وه‌ له‌ خراپه‌ى فيتنه‌ى ژيان و مردن) .

**٥٤٢ - أبو هريرة** رضي الله عنه فەرمووی : (گوێبیستی أبا القاسم بووم ﷺ پەنای ئەگرت بە الله لە فیتنەی ژیان و مردن، وە لە سزای گۆڕ، وە لە خراپەی مەسیحی دەججال) .

**٥٤٣ - أبي هريرة** رضي الله عنه فەرمووی و بەرزی کردەوە : (بەڕاستی مردوو گوێی لە تەپەی نەعلەکانیان ئەبێت کاتێك - **هاوەڵەکانی** - پشتی لێئەکەن و ئەڕۆن).

**٥٤٤ - سعيد بن المسيب** وتی : گوێبیستی أبو هريرة بووین رضي الله عنه لەسەر نەفسێک کە هەرگیز هیچ تاوانێکی ئەنجام نەدابوو ئەیفەرموو : (ئەی پەروەردگارم بیپارێزە لە سزای گۆڕ) .

---

**: (لەسەر نەفسێک کە هەرگیز هیچ تاوانێکی ئەنجام نەدابوو) واتە منداڵێک کە لەدایک ئەبێت و پاشان ئەمرێت، والله أعلم .**

**٥٤٥ - أنس بن مالك** رضي الله عنه وتی : پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت بەلای باخە خورمایەکی بەنی النجار دا، دەنگێکی بیست لە گۆڕێکەوە، فەرمووی : (خاوەنی ئەم قەبرە کەی مردووە ؟) .

وتیان : لە جاهیلیدا مردووە - واتە پێش ئیسلام - .

فەرمووی : (ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت کە لەمەودوا مردوو نەنێژن ئەوا داوام ئەکرد لە الله کە سزای گۆڕ ببیستن) .

**٥٤٦ - أنس بن مالک** رضي الله فەرمووی : (پێغەمبەر ﷺ چووە ژوورەوە بۆ ڕووخاوەیەکی بەنی النجار بۆ ئەوەی پێویستیەکی جێبەجێ بکات، بە شڵەژاوی هاتە دەرەوە بۆ لامان و فەرمووی : ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت کە لەمەوداوا مردوو نەنێژن ئەوا داوام ئەکرد لە الله ئەوەی من بیستم لە سزای ئەهلی گۆڕەکان ئێوەش ببیستن) .

**٥٤٧ - رسول الله** ﷺ فەرمووی : (ئەی پەروەردگارم من پەنات پێ ئەگرم لە تەمبەڵی و ترسنۆکی و پیری و ڕەزیلی و سزای گۆڕ، وە پەنات پێ ئەگرم لە فیتنەی ژیان و مردن) .

**٥٤٨ - هانئ ی مولی ی عثمان** وتی : عثمان رضي الله عنه کاتێك بووەستایە لەسەر قەبرێك ئەگریا هەتا ڕیشی تەڕ ئەبوو، پێی وترا : یادی بەهەشت و ئاگر دۆزەخ ئەکەیتەوە ناگریت کەچی بۆ ئەمە ئەگریت ؟

وتی : رسول الله ﷺ فەرمووی : (بەڕاستی گۆڕ یەکەم وێستگەی قیامەتە، ئەگەر لێی ڕزگاری بێت ئەوە دوای ئەو ئاسانترە، وە ئەگەر ڕزگاری نەبێت لێی ئەوە دوای ئەو قورسترە) .

وە کاتێك پێغەمبەر ﷺ تەواو ببوایە لە ناشتنی مردوویەك ئەوەستا لەسەری و ئەیفەرموو : (داوای لێخۆشبوون بۆ براکەتان بکەن، وە داوای جێگیربوونی بۆ بکەن، چونکە ئێستا پرسیاری لێئەکرێت) .

**٥٤٩** - **عبدالله بن مسعود** دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿ **فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا** ﴾ (طه : ١٢٤) .

فەرمووی : (سزای گۆڕە) .

**٥٥٠** - **البراء بن عازب** رضي الله عنه دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿ **يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ وَيُضِلُّ اللَّهُ الظَّالِمِينَ** ﴾ (إبراهيم : ٢٧) .

فەرمووی : (دابەزی دەربارەی سزای گۆڕ) .

**٥٥١** - **المسيب بن رافع** دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿ **يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ وَيُضِلُّ اللَّهُ الظَّالِمِينَ** ﴾ (إبراهيم : ٢٧) .

وتی : (دابەزی دەربارەی سزای گۆڕ) .

**٥٥٢** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (هەر کەسێك بمرێت لەکاتی سەنگەرگرتن دا، ئەپارێزرێت لە تاقیکردنەوەی گۆڕ، وە بێخەم ئەکرێت لە ترسانە هەرە گەورەکە - ترسی ڕۆژی قیامەت - . . . ) .

**٥٥٣** - **أنس بن مالك** رضي الله عنه وتی : پێغەمبەر ﷺ نوێژی كرد لەسەر منداڵێكی كچ یان كوڕ، جا فەرمووی : (ئەگەر یەكێك ڕزگاری ببوایە لە گوشینی گۆڕ ئەوا ئەم منداڵە ڕزگاری ئەبوو) .

**٥٥٤** - **رسول الله** ﷺ فەرمووی : (ئادەمیزاد لە گۆڕەكەیدا بەیانی و ئێوارە شوێنەكەی لە بەهەشت و ئاگری دۆزەخدا نیشان ئەدرێت) .

**٥٥٥** - **البراء** رضي الله عنه وتی : پێغەمبەر ﷺ باسی سزای گۆڕی كرد، فەرمووی : (پێی ئەوترێت - **واتە بە مردووەكە** - : پەروەردگارت كێیە ؟

ئەڵێت : پەروەردگارم الله یە، وە پێغەمبەرم محمد ە ﷺ) .

جا ئەمە وتەی عز وجل ە : | **يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ** | (إبراهيم : ٢٧) .

لەو قسەیانە مەبەستی موسوڵمانە .

**٥٥٦** - **رسول الله** ﷺ فەرمووی : (هیچ یەكێك لە ئێوە نییە - **واتە لە گۆڕدا** - ئیللا شوێنەكەی پیشان ئەدرێت لە بەیانی و ئێوارەدا، ئەگەر لە ئەهلی بەهەشت بوو، ئەوە شوێنەكەی لە بەهەشت پیشان ئەدرێت، وە ئەگەر لە ئەهلی ئاگری جەهەننەم بوو، ئەوە شوێنەكەی ئاگری جەهەننەم پیشان ئەدرێت، پێی ئەوترێت : ئەمە شوێنەكەتە هەتا زیندوو ئەكرێیتەوە بۆی) .

٥٥٧ - أبي صالح الحنفي دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل | مَعِيشَةً ضَنْكًا | (طه : ١٢٤) .

وتی : (هەواڵم پێدراوە کە ئەوە سزای گۆڕە) .

٥٥٨ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (کردەوەی زیندووەکان نیشانی مردووەکان ئەدرێت لە خێزانەکانیان و خزمەکانیان، جا ئەگەر بینیان چاکە بوو ؛ سوپاس و ستایشی الله ئەکەن و دڵ خۆش ئەبن، وە ئەگەر بینیان بێجگە لەوە بوو - واتە خراپ بوو - ، ئەڵێن : اللهم مەیانمرێنە تا هیدایەتیان ئەدەیت) .

٥٥٩ - عبيد بن عمير وتی : (ئەهلی گۆڕەکان باس و خواس ئەگۆڕنەوە، جا ئەگەر مردوویەك بێت بۆ لایان ئەڵێت : ئایا فلان هاتووە بۆ لاتان ؟

ئەوانیش ئەڵێن : بەڵێ، جا ئەهلی گۆڕەکان پرسیاریان لێئەکەن : فلان چی ئەکات ؟

ئەڵێن : چاکە ئەکات .

ئەڵێن : ئەی فلان چی ئەکات ؟

ئەڵێن : ئایا نەهاتووە بۆ لاتان ؟

ئەڵێن : نەخێر، إنا لله وإنا إليه راجعون، بۆ ڕێگایەکی جیاواز لە ڕێگای ئێمە براوە) .

٥٦٠ - أبي كريمة الكندي وتى : ئێمه دانیشتبووین له‌لای زاذان، ئه‌م ئایه‌ته‌ی خوێندرایه‌وه : ﴿وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا عَذَابًا دُونَ ذَلِكَ﴾ (الطور : ٤٧) .

زاذان وتى : (سزای گۆڕه) .

٥٦١ - عبيد بن عمير وتى : (به‌ڕاستی قه‌بر ئه‌گری و ئه‌ڵێت : من ماڵی ته‌نیایم، وه من ماڵی نامۆییم، وه من ماڵی كرمم) .

٥٦٢ - عبدالرحمن بن شماسة وتى : (كاتێك عمرو بن عاص رضي الله عنه گه‌یشته سه‌ره‌مه‌رگ فه‌رمووی : كاتێك منتان ناشت، دابنیشن له‌لام به ئه‌ندازه‌ی سه‌ربڕینی وشترێك و له‌تویه‌ت كردنی، هه‌تا ئارام و ئاسووده ببم به ئێوه) .

٥٦٣ - رسول الله ﷺ فه‌رمووی : (هه‌ر كه‌سێك له ڕۆژی جومعه‌دا یان شه‌وی جومعه‌دا بمرێت ئه‌پارێزرێت له تاقیكردنه‌وه‌ی گۆڕ) .

٥٦٤ - یحیى بن سعید ئه‌گێڕێته‌وه له المسعودي له عبدالله بن المخارق ـه‌وه له باوكیه‌وه كه عبدالله بن مسعود رضي الله عنه فه‌رمووی : (كاتك ئیماندار خرایه ناو گۆڕه‌كه‌یه‌وه، دائه‌نیشێنرێت له ناو گۆڕه‌كه‌یدا، پێی ئه‌وترێت : په‌روه‌ردگارت كێیه ؟ دینت چییه ؟ پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ت كێیه ؟

الله عز وجل جێگیری ئه‌كات و ئه‌ڵێت : (الله په‌روه‌ردگارمه، وه دینم ئیسلامه، وه پێغه‌مبه‌ره‌كه‌م محمد ـه ﷺ) .

دواتر قەبرەكەی بۆ فراوان ئەكرێت، وە تێیدا ئاسوودە ئەبێت).

عبدالله ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿ **يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّـٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ** ﴾ (إبْرَاهِيم : ٢٧).

وە كافریش كاتێك مرد دائەنیشێنرێت لە قەبرەكەیدا، پێی ئەوترێت : پەروەردگارت كێیە ؟ وە دینت چییە ؟ وە پێغەمبەرەكەت كێیە ؟

ئەڵێت : نازانم .

جا قەبرەكەی لەسەر تەنگ ئەكرێتەوە و لەناویدا عەزاب ئەدرێت).

عبدالله ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿ **وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا** ﴾ (طه: ١٢٤).

یحیى وتی : (ئەگەر هەر فەرموودەیەكتان بۆ باس بكەین، ئەوا بۆ بەڕاست خستنەوەی ئەوە - **واتە فەرموودەكە** - لە كتێبی الله عز وجل پێم ڕاگەیاندوون).

## باب : (١٩)

## پرسیاری لێکرا دەربارەی خەواریجەکان، وە ئەوەی فەرموویەتی : ئەوان سەگی ئاگرن



خەواریجەکان یەکەم کۆمەڵەی گومڕا بوون کە لە ئیسلامی حەق لایاندا و پێچەوانەی عەقیدەی هاوەڵە بەڕێزەکانیان کرد رضي الله عنهم .

سەرەتای دروستبوونیان ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئیمامی عثمان رضي الله عنە، وە پاشان لە سەردەمی ئیمامی علي دا رضي الله عنە دەرئەکەون و خروجی لەسەر ئەکەن و بە کافری ئەزانن، وە هاوەڵانی تریش رضي الله عنهم تەکفیر ئەکەن .

بێگومان ئەو کەسانەی کە لەسەر دەسەڵاتدارێکی موسوڵمان دەرئەچن ئەوانە خەواریجن، وە ئەوانەی لەسەر دەسەڵاتدارێکی کافر و موشریک دەرئەچن ئەوانە موجاهیدن .

لەم بەشەدا ئیمام فەرموودەی رسول الله ﷺ ئەهێنێت کە باسی دروستبوون و دەرچوونی خەوایجەکان ئەکات، وە پاشان ئەفەرموێت نزیکترین کۆمەڵە لە حەق لەو دوو کۆمەڵەیە (واتە کۆمەڵەی ئیمامی علي و ئیمامی معاوية رضي الله عنهم) شەڕیان لەگەڵ ئەکەن و ئەیانکوژن، وە هەروەها

رسول الله ﷺ به گشتی چەند وەسفێکی خەواریجەکان ئەکات تا پێیدا بناسرێنەوە، وە بە تایبەتی وەسفی جەستەی کەسێکیان ئەکات بۆ ئەوەی کە کوژرا بناسرێتەوە .

دواتر ئیمام باسی شەڕکردنی ئیمامی علي رضي الله عنه لەگەڵ خەواریجەکاندا ئەکات .

شایەنی باسە خەواریجەکان بەهۆی وازهێنانیان لە تێگەشتنی هاوەڵان بۆ ئیسلام و سوننەت تووشی ئەو گومڕاییە بوون، وە لە نێوان خۆیاندا چەندین گروپ و تاقمن و یەکتری تەکفیر ئەکەن، ئێستاش هەر ماون و عمومیە گڵاوەکانیش ڤێرژنێکی نوێی خەواریجەکانن کە ئیسلامەتی ڕووکەشی خەڵکی قبووڵ ناکەن وەک چۆن رسول الله ﷺ قبووڵی کردووە، خۆیان چەندین بیدعە دائەهێنن و دواتر خەڵکی لەسەر تەکفیر ئەکەن و بگرە خۆشیان لەناو خۆیاندا بەهۆی ئەو بیدعەیانەوە یەکتری تەکفیر ئەکەن .

ئەتوانن بگەڕێنەوە بۆ کتێبی (التنبيه والرد على أهل الأهواء والبدع) ی الملطي و (كتاب السنة) ی حرب الكرماني ئەثەری (**١٠٦**) بەدواوە بۆ ئاشنابوون بۆ زیاتر ئاشنابوون بە بیروباوەڕ و گروپەکانی خەرواریج .



**٥٦٥ - عبيدة السلماني** ئەگێڕێتەوە لە علي ـەوە رضي الله عنه وتی : رسول الله ﷺ فەرمووی : (کۆمەڵەیەک دەردەچێت پیاوێکیان تێدایە دەست کورتێکە ، یان دەست بچوکێکە وەکو سنگی ئافرەت ، یان دەست ناتەواوێکە .

وە ئەگەر لەخۆتان بایی نەبوونایە هەواڵم پێئەدان بەوەی الله چ بەڵێنێکی داوە بەوانەی شەڕیان لەگەڵدا ئەکەن لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ) .

عبیدة وتی : وتم بە علي رضي الله عنه : تۆ ئەمەت بیستوە لە رسول الله ـەوە ﷺ ؟

وتی : (بەڵێ سوێند بە پەروەردگاری کەعبە ، بەڵێ سوێند بە پەروەردگاری کەعبە ، بەڵێ سوێند بە پەروەردگاری کەعبە ) .

لە ڕیوایەتێکی تردا علي رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (بەڵێ نەک یەکجار ، بەڵکو دووجار و سێجار و چوارجار ) .

**٥٦٦ - رسول الله ﷺ** فەرمووی : (لە ئاخیری زەماندا کۆمەڵەیەک پەیدا ئەبن قورئان ئەخوێنن بەڵام لە قوڕگیان ناچێتە خوارەوە **- واتە لێی تێناگەن یان کاری پێناکەن -** ، دەرئەچن لە دین وەکو چۆن تیر لەو شتە دەرئەچێت کە ئاڕاستەی ئەکرێت ، وە شەڕ کردن لەگەڵیان حەقە لەسەر هەموو موسڵمانێك ) .

**٥٦٧ - أبي سعيد الخدري** رضي الله عنه وتی کە : (پێغەمبەر ﷺ باسی کۆمەڵەیەکی کرد لە ئوممەتەکەی ئەبن لەناو کۆمەڵەیەك خەڵکیدا دەرئەچن ، نیشانەکەیان بریتیە لە سەرتاشین ، وە ئەوان خراپترین دروستکراون - یان لە

خراپترین دروستكراوەكانن -، یەكێك لەو دوو كۆمەڵەیەی كە نزیكترینە لە حەق ئەیانكوژن) .

**٥٦٨** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (لە ئاخیری زەماندا گەنجانێكی تەمەن منداڵ دەرئەچن، كەم ئەقڵن - **جاهیل و نەفامن** -، قسە ئەكەن بە وتەی باشترینی خەڵكی، دەرئەچن لە دین هەروەكو چۆن تیر لەو شتە دەرئەچێت كە ئاڕاستەی ئەكرێت، هەركەسێك پێیان گەشت با بیان كوژێت، چونكە كوشتنیان پاداشتە لەلای الله عز وجل لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ ئەو كەسەی ئەیانكوژێت) .

**٥٦٩** - أبي موسى وتی : علي لە ڕۆژی النهروان دا فەرمووی : (بگەڕێن بە دوای ذَا الثُّدَيَّة دا) .

گەڕان بەدوایدا و نەیاندۆزیەوە، علي ناوچەوانی عارەقی پێدا ئەهاتە خوارەوە و فەرمووی : (سوێند بە الله نە درۆم كردووە و نە درۆشم لەگەڵ كراوە).

دواتر دۆزرایەوە، بە قاچەكانی دەرهێنرا لە ژێر كوژراوەكاندا، جا علي رضي الله عنه سوجدەی شوكری برد .

---

: (النهروان) ئەو شوێنە بوو كە شەڕی نێوان ئیمامی علي رضي الله عنه و خەواریجەكان تێیدا ڕوویدا .

٥٧٠ - أبو جحيفة وتی : علي رضي الله عنه كاتێك تەواو بوو لە شەڕی حەروریەکان فەرمووی : (پیاوێکیان تێدایە دەست گۆجێکە، وە ئێسقان بە قۆڵیەوە نییە، بە قۆڵیەوە گۆیەکی پێوەیە وەکو گۆی مەمک، مووی درێژ و لولی پێوەیە) .

جا گەڕان بەدوایدا نەیان دۆزیەوە، پاشان گەڕان بەدوایدا نەیان دۆزیەوە، وە منیش لەناو ئەوانەدا بووم کە ئەگەڕان بەدوایدا، هەرگیز علي رضي الله عنه وەکو ئەوڕۆژە بەبێ ئارامی نەبینیبوو .

وتیان : ئەی ئەمیری ئیمانداران نەمان دۆزیەوە .

فەرمووی : (ناوی ئەم شوێنە چیە ؟)

وتیان : النهروان .

فەرمووی : (درۆتان کرد، لەناویاندایە، بگەڕێن بەدوایدا) .

جا گەڕاین بەدوایدا لەناو کوژراوەکاندا نەمان دۆزیەوە، دواتر گەڕاینەوە بۆ لای، وتمان : ئەی ئەمیری ئیمانداران نەمان دۆزیەوە .

جا پرسیاری کرد دەربارەی شوێنەکە و پێیان وت، فەرمووی : (الله ونێردراوەکەی ڕاستیان کرد، وە ئێوە درۆتان کرد، ئەو لەناویاندایە، بگەڕێن بەدوایدا) .

جا گەڕاین بەدوایدا و دۆزیمانەوە لە جۆگەلەیەکدا و هێنامان، سەیری قۆڵەکەیم کرد کە هیچ ئێسقانێکی پێوە نەبوو، گۆیەکی پێوەبوو وەکو گۆی مەمکی ئافرەت، مووی درێژ و لولی پێوەبوو) .

٥٧١ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (دەرچوانێك دەرئەچن لە كۆمەڵەیەك لە موسڵمانان، نزیكترینی ئەو دوو كۆمەڵەیە لە حەق ئەیانكوژن) .

٥٧٢ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (خەواریجەكان سەگی ئاگرن) .

٥٧٣ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (قیامەت هەڵناستێت هەتا دوو كۆمەڵەی گەورە لەگەڵ یەكتر بە جەنگ نەیەن، بانگەوازیان لە دیندا یەك شتە، لە نێوانیاندا دەرچوانێك دەرئەچن، نزیكترینیان لە حەق ئەیانكوژن) .

٥٧٤ - أبي الطفيل وتی : ابن الكواء پرسیاری كرد لە علي دەرباری | الْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا | .

فەرمووی : (ئەهلی حروراء - واتە خەواریجەكان - لەوانەن) .

---

مەبەستی لەو ئایەتەیە : | قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِٱلْأَخْسَرِينَ أَعْمَٰلًا * ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا | (الكَهْفِ : ١٠٣ - ١٠٤) .

٥٧٥ - كعب الأحبار وتی : (ئەو كەسەی خەواریج ئەیكوژێت دە نووری بۆ هەیە، بە هەشت نوور بەسەر شەهیدەكانی تردا لە غەیری خۆی بەرزكراوەتەوە).

٥٧٦ - له **مصعب بن سعد بن أبي وقاص** ـه‌وه كه باسی خه‌واریجه‌كان له‌لای باوكی كرا، فه‌رمووی : (ئه‌وانه كه‌سانێك بوون لایاندا **- واته له حه‌ق -**، جا الله عز وجل یش دڵیانی له لادا **- له حه‌ق -** ) .

٥٧٧ - **نافع** وتی : (إبن عمر رضي الله عنه كوشتاری حه‌روریه‌كانی به حه‌ق و واجبێك ئه‌بینی له‌سه‌ر موسڵمانان ) .

٥٧٨ - عاصم بن بهدلة وتی : خه‌واریجێك ده‌رچوو له كوفه، وترا : ئه‌ی **أبو وائل** ئه‌مه خه‌واریجێك بوو ده‌رچوو دواتر كوژرا .

فه‌رمووی : (سوێند به الله ئه‌مه نه دینی الله ی سه‌رخست، وه نه به‌رگری كرد له زوڵملێكراوێک ) .

٥٧٩ - **أبي أمامة** رضي الله عنه ده‌رباره‌ی فه‌رمایشتی الله عز وجل : | **فَلَمَّا زَاغُوا أَزَاغَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ** | (الصف : ٥) .

فه‌رمووی : (ئه‌وانه خه‌واریجه‌كانن ) .

٥٨٠ - له أبي غالب ـه‌وه، كه **أبي أمامة** رضي الله عنه چه‌ند كه‌لله سه‌رێكی بینی هه‌ڵواسرابوو له‌سه‌ر پلیكانه‌كانی مزگه‌وتی دیمه‌شق، أبو أمامة فه‌رمووی : سه‌گی ئاگر - سێ جار -، خراپترین كوژراو له‌ژێر ئاسۆی ئاسماندا، باشترین

كوژراو ئەو كەسەیە كە كوشتویانە، پاشان ئەمەی خوێندەوە: ﴿يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ﴾ (آل عمران: ١٠٦).

وتم بە أبي أمامة: تۆ ئەمەت بیستووە لە رسول الله ـەوە ﷺ؟

فەرمووی: (ئەگەر من نەمبیستبایە زیاتر لە دوو جار یان سێ جار یان چوار جار یان پێنج جار یان شەش جار یان حەوت جار ئەوا باسی ئەوەم بۆ نەئەكردیت).

**٥٨١ - سعيد بن جهمان** وتی: گەیشتم بە عبدالله بن أبي أوفى رضي الله عنه و بینایی لەدەستدابوو، جا سەلامم لێكرد، پێی وتم: (تۆ كێیت؟).

وتم: من سعيد ی كوڕی جهمان م.

فەرمووی: (باوكت چی ئەكات؟).

وتم: الأزارقة كان كوشتیان.

فەرمووی: (لەعنەتی الله لە الأزارقة كان بێت، لەعنەتی الله لە الأزارقة كان بێت، لەعنەتی الله لە الأزارقة كان بێت، بۆی باسكردین رسول الله ﷺ: **ئەوانە سەگی ئاگرن**).

وتم: الأزارقة بە تەنیا؟ یان خەواریجەكان هەموویان؟

فەرمووی: (نەخێر، بەڵكوو خەواریجەكان هەموویان).



٥٨٢ - جابر بن عبد الله رضي الله عنه وتی : فەرمووده‌یەكم پێ گەیشت لە پیاوێكەوە كە بیستبووی لە رسول الله ـەوە ﷺ، جا حوشترێكم كڕی و پاشان شتومەكەكانی سەفەرم لەسەر پشتی دانا و گەشتم كرد بە درێژایی مانگێك بۆ لای هەتاوەكوو گەشتمە شام و لای عبدالله بن أنيس، وتم بە دەرگاوانەكە : پێی بڵێ : جابر لەبەر دەرگایە .

وتی : كوڕی عبدالله ؟

وتم: بەڵێ .

دەرچوو و پێی ئەنا بەسەر جلەكەیدا - لە خێراییدا - و باوەشی پێمدا كرد، و منیش باوەشم پێیدا كرد، وتم : فەرمووده‌یەكم پێگەیشتووە لە تۆوە كە بیستووتە لە رسول الله ـەوە ﷺ دەربارەی تۆڵە سەندنەوە، ترسام لەوەی بمریت یان من بمرم پێش ئەوەی بیبیستم .

وتی : گوێم لە رسول الله بوو ﷺ ئەیفەرموو : (خەڵكی - یان فەرمووی : بەندەكان - حەشر ئەكرێن لە ڕۆژی قیامەتدا بە ڕوتی و خەتەنە نەكراوی و هیچ شتێكیان پێ نیە) .

وتمان : (بُهْمًا) مانای چیە ؟

فەرمووى : (واتە هیچ شتێكیان پێ نیە .

پاشان بانگیان ئەكات بە دەنگێك ئەوەی كە لە دوورو ئەیبیستێت وەكو ئەوەی كە لە نزیكە : منم الملك، منم الديان، بۆ هیچ كەسێك نیە لە ئەهلی دۆزەخ كە بچێتە دۆزەخەوە لە كاتێكدا حەقێكی هەبێت لەلای یەكێك لە ئەهلی بەهەشت هەتاوەكو حەقەكەی بۆ وەرئەگرمەوە، وە بۆ هیچ كەسێك نیە لە ئەهلی بەهەشت كە بچێتە بەهەشتەوە لە كاتێكدا حەقێكی هەبێت لەلای یەكێك لە ئەهلی دۆزەخ هەتاوەكو حەقەكەی بۆ وەرئەگرمەوە، هەتا ئەگەر زللەیەكیش بێت ) .

وتمان : چۆن ئەوە ئەبێت لە كاتێكدا ئێمە بە رووتی و خەتەنە نەكراوی وبێ ئەوەی هیچ شتێكمان پێ بێت دێینە لای الله عز وجل ؟

فەرمووى : (بە چاكە و خراپەوە ) .

٥٨٣ - عبدالله بن عباس رضي الله عنه فەرمووى : (بیربكەنەوە لە هەموو شتێك، وە بیر مەكەنەوە لە ذاتی الله، چونكە لە نێوان حەوت ئاسمانەكان و كورسیەكەی حەفتا هەزار نوور هەیە، وە ئەو لەسەرووی ئەوەوەیە ) .

٥٨٤ - پێغەمبەر ﷺ فەرمووى : (الله - لە رۆژی قیامەتدا - ئەفەرمووێت : ئەی ئادەم .

ئادەمیش ئەڵێت : لە خزمەتدام .

جا بەدەنگێك بانگی لێ ئەكرێت : بەڕاستی الله فەرمانت پێ ئەكات كە لە نەوەكانت كۆمەڵێك دەربهێنیت كە ئەنێردرێن بۆ دۆزەخ ) .

٥٨٥ - مقاتل بن حيان دەربارەی وتەی الله عز وجل : ﴿ مَا يَكُونُ مِنْ نَّجْوَىٰ ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ ﴾ (المجادلة : ٧) .

وتی : (ئەو لەسەر عەرشەكەیەتی وە عیلمەكەی لەگەڵیاندایە .

٥٨٦ - عبدالله بن مسعود رضي الله عنه فەرمووی : (نێوان ئاسمانی هەرە بەرز - واتە ئاسمانی حەوتەم - و الكرسي پێنج سەد ساڵە، وە نێوان الكرسي و ئاو بەهەمان شێوەیە، وە عەرش لەسەر ئاوە، وە الله ش لەسەر عەرشە، هیچ شتێك لە كردەوەكانی ئێوەی لێ شاراوە نییە ) .

٥٨٧ - لە سعيد بن عامر الضبعي كە باسی جەهمیەكان كرا لەلای فەرمووی : (ئەوانە وتەكەیان خراپترە لە جولەكە و نەسڕانیەكان، جولەكە و نەسڕانیەكان و ئەهلی هەموو دینەكان لەگەڵ موسڵمانان كۆكن لەسەر ئەوەی الله لەسەر عەرشە، وە - جەهمیەكان - وتیان : هیچی لەسەر نییە ) .

٥٨٨ - إبن عباس رضي الله عنهما دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿ وَاصْنَعِ الْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا ﴾ (هود : ٣٧) .

فەرمووی : (بە بەرچاوی الله عز وجل ـەوە ) .

**٥٨٩** - **عبد الله بن مسعود** رضي الله عنه فەرمووی : (بەڕاستی الله ڕوانیە دڵی بەندەکان، محمد ی ﷺ هەڵبژارد، دواتر بە پەیامەکەیەوە ناردی، پاشان ڕوانیە دڵی بەندەکان هاوەڵانێکی بۆ هەڵبژارد و کردنیە سەرخەری دینەکەی و وەزیری پێغەمبەرەکەی، جا ئەوەی موسڵمانان - **واتە هاوەڵانی رسول الله ﷺ** - بە چاکی ببینن ؛ ئەوە لەلای الله چاکەیە، وە ئەوەی موسڵمانان - **واتە هاوەڵانی رسول الله ﷺ** - بە ناشرینی ببینن، ئەوە لەلای الله ناشرینە) .

**٥٩٠** - **حبیب** وتی : ئامادە بووم لەلای خالد بن عبدالله القسري کاتێک لە واسط وتاری بۆ خەڵکی ئەدا لە ڕۆژی جەژنی قوربان دا، فەرمووی : ئەی خەڵکینە بگەڕێنەوە و قوربانیەکانتان سەر ببڕن الله لێتانی قبووڵ بکات، وە منیش قوربانی ئەکەم بە جعد بن درهم؛ چونکە پێی وایە الله تبارك وتعالی إبراهیم ی نەکردووە بە خۆشەویستی خۆی، وە الله بە قسە کردن قسەی نەکردووە لەگەڵ موسی دا، بەرز و بڵندی بۆ الله لەوەی کە جعد بن درهم ئەیڵێت) .

پاشان دابەزی و سەری بڕی .

**والحمد لله رَبِّ العالمين**

**وصلاته على خير خلقه محمد خاتم النبيين، وآله وأصحابه، وأزواجه، والتابعين رضي الله عنهم أجمعين**

# پێڕست